**سیماکانی ئیسلام**

نووسینی صالاح الدین أحمد

نەخشەسازی ناوەوە و بەرگ: زەردەشت کاوانی

ساڵی چاپ : یەکەم / ١٤٤٤ ك - ٢٠٢٣ ز

پێوانە: ١٤ × ٢١

# سیماکانی ئیسلام

نووسینی

صلاح الدین احمد

# پێشەكی

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئیسلام وەك دوایین پەیامی خودایی بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی هاتووە بە مەبەستی ڕاستەڕێکردن و هیدایەتدان و فێرکردن و تەزکیە و پاکردنەوەی مرۆڤ، بۆ هێشتنەوەی لەسەر فیترەت و بنەچە پاکەکەی، بۆ بیرکردنەوەی درووست و ناخپاکی و کردەوەجوانی و گوفتار و ڕەفتار بەرزی، بۆ هزرین و عەقڵکاری، بۆ زانست و بەدواداچوون، بۆ ئەخلاقی بوون و گەیشتن بە بەها بەرز و باڵاکان، بۆ ئاشتەوایی کۆمەڵایەتی و جیهانی، بۆ ئارامی دڵ و دەروون، بۆ ڕاگرتنی ستەمکار و زاڵمان، بۆ عەدل و ئیحسان، بۆ میانڕەویی و وەسەتیەت، بۆ واقیعی بوون و ئامانجداری، بۆ هیوا و ئومێد، بۆ پێشکەوتن و گەشەسەندن، بۆ خوداپەرستی حەقیقی، بۆ پێکەوەژیان و لابردنی چینایەتی، بۆ دوورکەوتنەوە لە هەموو پیسی و نائەخلاقی و ناشیرینییێك، بۆ دووربوون لە هەموو زیانبەخش و وێرانکارییێك، بۆ.......

ئیسلام وەك کۆتا ئایین و پەیامی خوایی زۆرترین کاریگەری بەدوای خۆیدا هێنا، کاریگەرییەکان هەمەلایەن و فرە ڕەهەند بوون: تاك، خێزان، کۆمەڵگە، نەتەوە، دەوڵەت، سیاسەت، ئابووری، فەلسەفە و فکر و....، هەر لەم سۆنگەیەوە زۆرترین قسە و باسیشی بەدوای خۆیدا هێنا، سەدان و هەزاران و ملیۆنان زانا و بیرمەند لەسەر دەستیدا پەروەردە بوون، دەیان و سەدان ڕۆڵ و کاریگەری دیاری هەبووە و لە

دەستەڵاتدا بووە (بەڵام تەواو وەك خۆی نا)، قسەکردن لەسەر کۆی ئیسلام وا ئاسان نییە، بەڵام ویستمان ئەگەر هەموویشمان پێنەکرێت، هەمووی واز لێ نەهێنین.

## مەنهەجمان لە نووسینی ئەم پەرتووکە :

**١.** کورتی و پوختی و درێژدانەدڕی، ئەوەش بۆ گەورە نەبوونی ئەندازەی کتێبەکە و لاپەڕەکانی و بێزارنەکردنی خوێنەران و ئاسان بە چاپ گەیاندن و ئاسان بڵاوبوونەوە و ئاسان کڕین و فرۆشتنی، ئەگەرنا کتێبەکە خۆی درێژ بوو، بەڵام ئێمە کورتمان کردەوە لەبەر ئەم مەبەستانە.

**٢.** ڕوونی و سادەیی و بێ گرێوگۆڵی، بۆئەوەی بگات بەدەستی زۆرترین کەس و زۆرترین کەس سوودی لێ ببینن.

## چەند تێبینییەك

**١.** ئەم پەرتووکە کۆی گشتی ئیسلام نییە، چونکە بەدەیان پەرتووکی ئاواش ئیسلام هەمووی بەتەواوی ناگەیەنرێت، بەڵکو ئەمە وەك دەروازە و نەخشەیەکە بۆ ناسینی ئیسلام.

**٢.** ئەم پەرتووکە بۆ دوو جۆر کەسە:

**یەك:** باوەڕدار و موسڵمانەکان، بۆ ئەوەی بۆیان ببێتە دەروازەیەکی باش بۆ ناسینی ئیسلام و چوونە ناوەوەی.

**دوو:** بۆ ناباوەڕ و بێباوەڕەکان و نائاشنایان بە ئیسلام و ئیمان، بۆئەوەی باش ئیسلام ـ وەك خۆی ـ بناسن و لە ڕووحی ئیسلام تێبگەن و وەڵامێکیش بێت بۆ قین لەدڵ و دڵنەخۆشان.

**٣.** بۆ زیاتر ئاشنابوون بە ئیسلام و ناوەڕۆکی بابەتەکان بگەڕێنەوە بۆ پەرتووکمان (ئیسلام وەك خۆی)، چونکە ئەم نووسینەی بەردەستان بەشێکی بچووکە لە پەرتووکی (ئیسلام وەك خۆی).

**٤.** ئەم پەرتوکە بەشێوازێك نووسراوە بتوانرێت بکرێتە پرۆگرام و مەنهەجی خوێندن و خوێندنەوە و دەرس.

# ئیسلام

**ئیسلام:** بریتییە لە پەیامێکی خودایی و سیستمێکی گشتی و یاسایێکی گشتگیر بۆ تاك، خێزان، کۆمەڵگە، گەل، نەتەوە، دەوڵەت، مرۆڤایەتی و جیهان، کار دەکات لەسەر هەرسێ بەشەکەی مرۆڤ: (عەقڵ و ڕووح و جەستە)، یان بڵێین (عەقڵ، بیر، فکر، ناخ، ڕووح، خوڕەوشت، کردار، گوفتار و مامەڵە)، بەشێوەیەك هەوڵ دەدات ڕێنماییەکی تەواو و ڕێکوپێك و جوانی هەموو ئەم بەشانە بکات و کەموکوڕی و ناتەواوی و ناشیرینی ئەو بەشانە نەهێڵێت و لەسەر فیترەت بیانهێڵێتەوە و پەروەردەیان بکات، بەشێوەیەك کە لە خزمەت مرۆڤ و مرۆڤایەتی و خودای گەورەدا بەکاریان بێنێت و دنیاو دواڕۆژیان پێ ڕووناك بکاتەوە. ئینجا کە مرۆڤێکی بەم شێوە جوانە پەروەردە کرد، ڕاستەوخۆ خێزان و کۆمەڵگە و گەل و نەتەوە و دەوڵەت و جیهان پەروەردە دەبێت و دەکەونە سەر ڕێڕەوێکی دروست و هاوسەنگ.

## * بوارەکانی کارکردنی ئیسلام

لەپێشەوە گوتمان ئیسلام کار لەسەر تاك، خێزان، کۆمەڵگە، نەتەوە، گەل و دەوڵەت دەکات، بەشێوەیەك کە سیستەم و بەرنامە بۆ هەموویان دادەنێت بەبێ ئەوەی تێکگیران ڕووبدات لەگەڵ عەقڵ، فکر، سروشت، ڕووح، ناخ و لاشە و مامەڵەیان، بەڵام لەکۆتاییدا هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ مرۆڤ خۆی وەك تاك، بۆیە لێرەدا باسی مرۆڤ دەکەین.



* بەشە سەرەكییەكانی مرۆڤ و ڕینمایی ئیسلام بۆیان:

**١. عەقڵ:** ئیسلام بەرنامەیەكی تێروتەسەل و جوانی هەیە بۆ ڕێنموونی عەقڵ و فكر. وەڵامی تەواوی پێیە بۆ پرسیارە عەقڵی و فكری و فەلسەفییەكان، بەشێوەیەك هیچ شتێك نابینیت لە بنەما نەگۆڕەكانی ئیسلام كە لەگەڵ عەقڵ تێك بگیرێن. بەڵگەش لەسەر ئەوەی كە ئیسلام بەرنامە و وەڵامی تەواوی پێیە، قورئان و سوننەتە. هەروەها هەبوونی زانستێكی گرنگ و فراوان بەناوی زانستی بیروباوەڕ (علم العقیدة الإسلامیة). دواتر هەبوونی فكر و فەلسەفەی ئیسلامی، كە هەر یەكێكیان بە سەدان و هەزاران پەرتووكی لەبارەیەوە نووسراوە، بۆیە هیچ بابەتێكی عەقیدەیی، فكری، فەلسەفی و زانستی نابینیت كە زانایان و بیرمەندان و فەیلوسوفان لێی نەدوابن و پەرتووك و توێژینەوەیان لەبارەیەوە نەنوسیبێت. هەروەك لە ئیسلامدا ڕێگری لە بیركردنەوە و عەقڵ بەكارهینان نەكراوە، بەڵكوو فەرمانی بەكارهێنانی پێ كراوە. هەروەها هەموو شتێك كە زیان بە عەقڵ و بیر و هۆش بگەیەنێت، یاساغ و حەرام كراوە. بۆنموونە  مادده هۆش بەرەكان. كەواتە ئیسلام بەشە سەرەكییەكەی مرۆڤی پشتگوێ نەخست كە بریتییە لە عەقڵ.

**٢. ڕووح و ناخ:** ئیسلام بەرنامەیەكی تێر و تەسەل و جوانی هەیە بۆ ڕێنمونی كردن و ئاراستەكردنی ڕووح و دڵ و دەروون، هەروەها ناتەواوی و ناڕێكی و كەموكوڕی و بۆشاییەكانی بۆ پڕدەكاتەوە، بۆیە هیچ شتێك نابینی لە ئیسلامدا كە لەگەڵ ڕووح و ناخ، دڵ و دەروون، فیترەت و خوڕەوشت و ئاكاری مرۆڤدا نەگونجێت و تێك

بگیرێت. بەڵگەش لەسەر ئەمە قورئان و سونەتە، هەروەها هەبوونی زانستێك بەناوی زاستی پاككردنەوەی ڕووح و دڵ و دەرون (علم تزكية النفس)، یان زانستی ڕەوشت (علم الاخلاق)، كە كار دەكات لەسەر ئەوەی پێویستە مرۆڤ خۆی بە هەموو ڕەوشتێكی جوان و باش برازێنێتەوە لە ناوەوەو لە دەرەوەی خۆیدا. هەروەها خۆی داڕنێت و دووركەوێتەوە لە هەموو ڕەوشتێكی ناشرین و خراپ لە ناوەوە و لە دەرەوەی. كەواتە ئیسلام ئەو بەشە سەرەكییەی تری مرۆڤی پشت گوێ نەخست و گرنگیەكی تەواوی پێ داوە و ڕێنمایی تەواوی كردووە و بۆشاییەكانی پڕكردووەتەوە و هیچ شتێكی تێدا نییە كە لەگەڵیدا تێك بگیرێت، بۆیە ئەو بەشەش كە جوان و ڕێكوپێك بوو، ڕاستەوخۆ ڕەنگدانەوەی ئەرێنی و جوان و باشی دەبێت لەسەر گوفتار و ڕەفتار.

**٣. لاشە و جەستە و ئەندامە دیارەكان:** ئەم لایەنەش دەبێت بە دوو بەشەوە:

**یەكەم:** پەیوەندی مرۆڤ بە خوداوە

**دووەم:** پەیوەندی مرۆڤ بە مرۆڤەوە

**یەكەم:** پەیوەندی مرۆڤە بە خوداوە:

خۆی لە پەرستشەكان (العبادات) دا دەبینێتە وەك: نوێژ، ڕۆژوو، حەج، زەكات و... هتد، ئیسلام گرنگییەكی زۆری پێ داوە و بەرنامە و سیستمێكی تایبەتی بۆ داناوە، هەم لەڕێی قورئان و هەم لەڕێی سونەت و پاشان هەم لەڕێی زانایان و دانانی زانستێك بەناوی (فیقهـ) (علم الفقه الإسلامي)، كە بە سەدان و هەزاران پەرتووكی لەبارەیەوە نووسراوە و هیچ شتێكی شاراوە نەماوە قسەی تێدا نەكردبێت. كەواتە



ئيسلام ئەو بەشەی مرۆڤيشی پشتگوێ نەخستووە، بەڵكوو زۆر بەجوانی پەيوەندی نێوان مرۆڤ و خودای گەورەی ڕێكخستووە.

**دووەم:** پەيوەندی نێوان مرۆڤەكان (المعاملات):

ئيسلام زۆر بەجوانی و ڕێكوپێكی بەرنامەی بۆ داناوە، بەشێوەيەك كە هيچ شتێكی تێدا نييە كە لەگەڵ مرۆڤ و مرۆڤايەتی، عەقڵ، سروشت، فيترەت، ڕووح و ناخی مرۆڤدا نەگونجێت. ئەم بەرنامە و گرنگی پێدانە هەم لە قورئان، هەم لە سوننەت و هەم لە زانستی (فقه) بوونی هەيە. بۆنموونە ئەو ياسانەی ئەمڕۆ باون و كاريان پێ دەكرێت لە جيهاندا، هەمووی ياسای زۆر جوانتر، باشتر، رێكوپێكتر و تێروتەسەلتر لە ئيسلامدا بوونيان هەيە، وەك:

١. ياسای باری كەسێتی (قانون الاحوال الشخصيه)
٢. ياسای شارستانی (القانون المدني)
٣. ياسای دادبينی (قانون المرافعات)
٤. ياسای تايبەتيی نێودەوڵەتی( القانون الدولي الخاص)
٥. ياسای گشتيی نێودەڵەتی (القانون الدولي العام)
٦. ياسای دەستووری (القانون الدستوري)
٧. ياسای دارايی (القانون المالي)
٨. ياسای تاوانكاری ( القانون الجنائي)

بۆيە بينيمان كە ئيسلام بەرنامەی تەواو و جوان و تێروتەسەلی پێيە بۆ هەموو ئەو بوارانە، هەرشتێكيش زيانی هەبێت بۆ هەريەكێك لەم



بوارانە، ئەوا یاساغ و حەرامی كردووە، هەروەها بەتەواوەتی سوود و قازانج و بەرژەوەندی تاك و خێزان، كۆمەڵگە و گەل، نەتەوە و دەوڵەتی ڕەچاو كردووە و هیچ شتێكی دانەناوە كە زیانی بۆ ئەوانە هەبێت و تێك بگیرێت لەگەڵیاندا، بەڵكوو هەرچی سوودی هەیە بۆی داناون و ڕێگری لێ نەكردوون.

### * تایبەتمەندییە گشتییەكانی ئیسلام

**١.** سەرچاوەكەی خوداییيە.

**٢.** پەیامەكەی گشتی و جیهانییە بۆ هەموو مرۆڤ و كات و شوێن و سیستمەكان و...

**٣.** بەرنامەكەی گشتگیرە بۆ هەموو بوارەكانی ژیان.

**٤.** واقیعییە و ڕەچاوی بارودۆخ و كات و شوێنەكان دەكات.

**٥.** میانڕەوە و دوورە لە زیادەڕەوی و كورتڕەوی.

**٦.** ڕوون و ئاشكرا و ڕاشكاوە.

**٧.** كۆكەرەوی نەگۆڕەكانی خۆی و گۆڕاو و گۆڕانكاری سەردەمەكانە.

**٨.** مرۆڤ دۆستە و لەگەڵ هەموو بەشەكانی مرۆڤ و مرۆڤایەتی دەگونجێت.

### * ئامانجە گشتییەكانی ئیسلام

**١.** پەروەردەكردن و دروستكردنی مروڤێكی باش، بەڕەوشت، چاكەخواز و تۆكمە, بە هەرسێ بەشەكەیەوە: عەقڵ و رۆح و جەستە.

**٢.** پەروەردەكردن و دروستكردنی خیزانێكی باش و بەڕەوشت و چاكەخواز و تۆكمە, بە هەرسێ بەشەكەیەوە: عەقڵ و رۆح و جەستە.

**٣.** پەروەردەكردن و دروستكردنی كۆمەڵگەیەكی باش، بەڕەوشت، چاكەخواز، شارستانی و تۆكمە, بە هەرسێ بەشەكەیەوە: عەقڵ و رۆح و جەستە.

**٤.** دروستكردنی دەوڵەتێكی باش، بەڕەوشت، چاكەخواز، دادپەروەر و مەدەنی.

كەواتە لێرەوە بۆمان دەردەكەوێت كە ئیسلام تاكە بەرنامەیە كە هەموو بوارەكانی مرۆڤ و مرۆڤایەتی تێدایە بەبێ ئەوەی لەگەڵ عەقڵ، بیر و هزر، ناخ و رووح، خوڕەوشت و كردار، گوفتار و مامەڵە، دونیا و دواڕۆژدا هیچ تێكگیرانێكی هەبێت. نەك هەر تێكگیرانی نییە، بەڵكو ڕێنمایی تەواو و ڕێكوپێك و جوان و تێروتەسەلی تیدایە بۆیان.

ئيسلام وەك ئايين و بەرنامەيەكی خوايی تايبەتمەندی خۆی هەيە، لێرەدا چەند تايبەتمەندييەك باس دەكەين:



## ميانڕەوی (وەسەتيەتی) ئيسلام (الوسطية)



ئيسلام يەكێك لە تايبەتمەندييە هەرە جوانييەكانی بريتييە لە ميانڕەويی (وەسەتيەت)، ميانڕەوی و (وەسەتيەت) لە عەقيدە و بيروباوەڕدا، لە عيبادەت و پەرستشتدا، لە تەشريع و ياسادا، لە ڕەوشت و بەهاكاندا.

ميانڕەوی (وەسەتيەت) واتە: هاوسەنگی و تەوازوون، واتە وەستان لە ناوەڕاست و دووربوون لە لاگيريی و پەڕگيری، (تطرف) هەر توندڕەوی ناگرێتەوە، بەڵكوو شلڕەويش دەگرێتەوە، چونكە (تطرف) واتە تەڕەفگيری، واتە تەڕەف و لايەك بگری، يان لای شلی يان لای توندی. ميانڕەوی (وەسەتيەت) بۆيە گرينگە چونكە دوورە لە لاڕێبوون و داڕمان و ڕووخان، چونكە ئەوەی لە ناوەڕاستدا دەوەستێت ئەگەری كەوتنی زۆر كەمە، بەڵام ئەوەی لەسەر ڕۆخەكان و لە لاكان دەوەستێت ڕۆژێ دێت بەردەبێتەوە و دەكەوێت.

### ناوەندگيری (وەسەتيەت) ئيسلام لە عەقيدە و بيروباوەڕدا

ئيسلام لە ڕووی بيروباوەڕەوە ميانڕەوە و دوورە لە ئەملا و ئەولا گرتن، بۆنموونە:



**١.** ناوەندگیرە لە نێوان خوڕافییەکان و ماددییەکاندا، چونکە خوڕافییەکان لە باوەڕدا تێیانپەڕاندووە و باوەڕ بە هەموو شتێك دەکەن، ماددییەکانیش دووبارە تێیانپەڕاندووە و باوەڕ بەهیچ شتێك ناکەن لەدەرەوەی ماددەدا، بەڵام هەردووکیان هەڵەن ئەوەی ئیسلام ڕاستە کە لەم نێوەندەدا وەستاوە و دوورە لە خوڕافیبوون و ماددیگەرایی.

**٢.** ناوەندگیرە لە نێوان مولحیدەکان، ئەوانەی باوەڕ بە هیچ خوایەك ناهێنن و لە نێوان ئەوانەی باوەڕ بە هەموو خودایەك دێنن و هەتا دێن مانگا یان مشکێك دەپەرستن!

**٣.** ناوەندگیرە لە نێوان ئەوانەی بوون و گەردوونیان کردووە بە حەقیقەتی ڕەها و لە دەرەوەی گەردوون باوەڕیان بە شتێکی تر نییە، لەگەڵ ئەوانەی بە هیچ جۆرێك باوەڕیان بە بوون و گەردوونیش نییە و پێیان وایە خەون و خەیاڵە. ئیسلام باوەڕی بەگەردوون هەیە، بەڵام لە پشت ئەویش باوەڕی بە حەقیقەتێکی زۆر گەورەتر هەیە کە خودایە.

**٤.** ناوەنگیرە لە نێوان ئەوانەی مرۆڤ دەکەن بە خودا، یان دەیکەن بە کۆیلە و ژێر دەستەی باری ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی، واتە هەندێك دەیکەن بە خودا هەندێکی تریش دەیکەن بە ڕۆبۆت و ئاژەڵێکی ڕووت.

**٥.** ناوەندگیرە لە نێوان ئەوانەی پێغەمبەران دەکەن بە خودا، لەگەڵ ئەوانەی بە درۆیاندەخەنەوە.

**٦.** ناوەندگیرە لە نێوان ئەوانەی سەرچاوەکانی زانیاری و مەعریفە کورت هەڵدێنن بەس لە عەقڵ، یان بەس ئەزموون، یان بەس ئیلهام



و کەشف یان بەس وەحی، واتە هەریەکەی بڕوای بە یەکێك هەیە و ئەوەی تر وەلا دەنێت.

## ناوەندگیری ئیسلام لە عیبادەت و پەرستشدا

ئیسلام لە عیبادەت و پەرستشیشدا ناوەندگیرە و میانڕەوە، چونکە ئێمە هەندێك ئاییمان هەیە عیبادەتی تەواو تەواو فەرامۆش کردووە لەولاشەوە هەندێکی ترمان هەیە هەموو شتێکی لێ بووە بە عیبادەت و داوا لە شوێنکەوتووانی دەکات خۆیان یەکلا بکەنەوە بۆ عیبادەت و دەست لە دونیا هەڵگرن، بەڵام ئیسلام ناوەندگیرە و گرنگی هەم بە دونیا دەدات هەم بە عیبادەت و دوارۆژ، لە ڕۆژێکدا پێنج نوێژی فەرزی داناوە و تەواو، ئیدی کاتەکانی تر مرۆڤ دەتوانێت خەریکی کارەکانی خۆی بێت، بەدەیان ئایەت و فەرموودەمان هەیە دژی زیدەڕۆیی لە عیبادەت و پەرستشدا، هەر بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: (فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِن فَضْلِ اللَّهِ وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ).[١]

واتا: ((جا کاتێك نوێژ تەواو بوو، ئەوە بڵاو ببنەوە بەزەویدا و بەتەمای بەخششی خوا هەوڵ و کۆشش بدەن، یادی خوا زۆر بکەن لە هەموو چالاکییەکانی ژیاندا با ناوی ئەو زاتە لەسەر زار و لەناو دڵتاندا بێت، بۆ ئەوەی سەرفرازیی هەمیشەیی بەدەست بهێنن.))

کەواتە دەفەرمووێت: کە نوێژی جومعەتان تەواوکرد بڕۆن و بە دوای ژیاندا بگەڕێن.

---

(١) [الجمعة، ١٠].

يان ئەو فەرموودەيەی سێ كەس هاتن بۆ لای پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێت)، یەكیان وتی: هەرگیز ژن ناهێنم، یەكیان وتی: شەو ناخەوم بەس عیبادەت دەكەم، یەكیشیان وتی: هەموو ڕۆژێك بە ڕۆژوو دەبم!

بەڵام پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێت.) هەموویانی بە هەڵە دانان و فەرمووی: من ژن دێنم و دەشخەوم و هەندێك ڕۆژ بەڕۆژوو دەبم و هەندێك ڕۆژی تریش پێنابم.

عن أنس بن مالك رضي الله عنه قال: ( جَاءَ ثَلاثُ رَهطٍ إِلَى بُيُوت أَزوَاج النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيه وَسَلَّمَ يَسأَلُونَ عَن عِبَادَة النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيه وَسَلَّمَ، فَلَمَّا أُخبِرُوا كَأَنَّهُم تَقَالُّوهَا، فَقَالُوا: وأَينَ نَحنُ منَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيه وَسَلَّمَ ؟ قَد غَفَرَ اللَّهُ لَهُ مَا تَقَدَّمَ من ذَنبه وَمَا تَأَخَّرَ، قَالَ أَحَدُهُم: أَمَّا أَنَا فَإِنِّي أُصَلِّي اللَّيلَ أَبَدًا، وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَصُومُ الدَّهرَ وَلَا أُفطِرُ، وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَعتَزِلُ النِّسَاءَ فَلَا أَتَزَوَّجُ أَبَدًا، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيه وَسَلَّمَ فَقَالَ: أَنتُمُ الَّذينَ قُلتُم كَذَا وَكَذَا ؟ أَمَا وَاللَّه إِنِّي لَأَخشَاكُم للَّه وَأَتقَاكُم لَه، لَكنِّي أَصُومُ وَأُفطِرُ، وَأُصَلِّي وَأَرقُدُ، وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَن رَغِبَ عَن سُنَّتِي فَلَيسَ مِنِّي).[1]

## ناوەندگیری ئیسلام لە ڕەوشتدا

ئیسلام تێڕوانینێكی ناوەندگیری هەیە بۆ ڕەوشت، چونكە ئێمە چەند تێڕوانینێكمان هەیە بۆ ڕەوشت، تێڕوانینێكی میسالی و خەیاڵی تێڕوانینێكی

---

(١) رواه البخاري (٥٠٦٣) ومسلم (١٤٠١).

نیسبی و ڕێژەیی و ماددی. میسالی وخەیاڵییەکان وەك فریشتە لە مرۆڤ دەڕوانن و دەیانەوێت مرۆڤ ببێتە فریشتە، ماددییەکانیش ڕەوشت لایان ڕێژەییە و بەپێی کات و شوێن و سەردەم دەگۆڕێت، هیچ ڕەوشتێکی نەگۆڕ بوونی نییە! بەڵکوو بەرژەوەندی پێوەرە! بەڵام ئیسلام وا نییە و لەو نێوەندەدایە، مرۆڤ لە ئیسلامدا نە فریشتەیە نە ئاژەڵ، بەڵکوو دروستکراوێکی ڕێزلێگیراوە کە عەقڵی هەیە، بەڵام لە هەمان کاتدا شەهوەت و ئارەزوو و پێداویستی نەفسی و جەستەییشی هەیە.

خاڵێکی تر بریتییە لە ژیانی دونیا، هەیە ژیانی دونیا لای هەموو شتێکە و ئێرە کۆتایی شتەکانە و پێی وایە بەس ئێرە جێی بایەخە، هەشە ژیانی دونیای پێ هیچ نییە و هیچ بایەخێکی بۆ دانانێت.

## ناوەندگیری ئیسلام لە تەشریع و یاسادا

ئیسلام لە ڕووی پڕاکتیکی و تەشریعی و یاساییشەوە ناوەندگیرە، چونکە ئەگەر بڕوانینە یەهوودییەت، دەبینین زێدەڕۆیی زۆر کراوە لە حەرامکردندا، ئەگەر بشڕوانینە نەسڕانییەت دەبینین زیدەڕۆی زۆر زۆر کراوە لە حەڵاڵکردندا و هەموو شتێکیان حەڵاڵکردووە، بەڵام ئیسلام لەو نێوەندەدایە و حەڵاڵ و حەرامی لەسەر بنەمای سوود و قازانجی مرۆڤ بە هاوسەنگی داناوە.

یان بۆنموونە  دەربارەی چەند ژنی و فرەژنی، زۆرێك لە ئایین و یاساکان بەتەواوی و بەبێ سنوور  حەڵاڵی دەکەن!، زۆرێکیش بەتەواوی تەحریم و قەدەغەی دەکەن!، بەڵام ئیسلام هاتووە ڕێکی خستووە و سنووردار و مەرجداری کردووە.

یان لە ڕووی ئابوورییەوە جیهان بوو بە دوو بەش، سەرمایەداری و كۆمۆنیزم و شیوعییەت، سەرمایەداری هەموو مافێك دەدات بە تاك ئەگەر لەسەر حیسابی ئەوانی تریش بێت، شیوعییەتیش هەموو مافێكی خاوەنداری لە تاك دەستێنێتەوە! بەڵام ئیسلام لەو نێوەندەدایە و مافی تاك و كۆمەڵ فەرامۆش ناكات و نادیدەی ناگرێت.

## هاوسەنگی و ناوەنگیری لە نێوان و ڕووحیبوون و ماددیبووندا

ئەگەر بڕوانییە مێژوو، دەبینین دوو ئاڕاستەی لادەر هەبوون دەربارەی ڕووح و ماددە. ڕووحییەكان هەموو شتێكیان لێ ببوو بە ڕووح و هەموو گرنگیەكیان بۆ لایەنی ڕووحی بوو و هەموو ژیانیان بۆ تێركردنی لایەنی ڕووحی بوو و هەموو خۆشییەكانی دونیایان وەلا نابوو، ئاڕاستەكەی بەرانبەریشی هەموو هەوڵێكی بۆ تێركردنی لایەنی ماددی بوو و هەموو شتێكی لە ماددە كورتهەڵێنابوو و لایەنی ڕووحی بەلا نابوو، ئەوەتا قورئان وتەی ئەو ماددییانەمان بۆ دەگێڕێتەوە، (وَقَالُوا إِنْ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ).[١] ((ئەوانە وتیان: ژیان هەر ئەم ژیانەی دنیایە و هیچی تر نیە، ئێمە زیندوو ناكرێینەوە (بۆ لێپرسینەوە).))

بەڵام ئیسلام لەو نێوەندەدایە و هەموو قورئان و سوننەت جەخت لەسەر هاوسەنگی نێوان ڕووح و ماددە و دونیا و قیامەت و عەقڵ و دڵ دەكەنەوە.

---

(١) [الانعام: ٢٩].



## ناوەندگیری و هاوسەنگی لەنیوان تاك و كۆمەڵگەدا

لە مێژوودا ململانێیەكی توند هەبووە لە نێوان مافی تاك و كۆمەڵگەدا، هەندێك تاكیان زاڵكردووە هەندێكی تریش كۆمەڵگە، هەندێك تاكیان وەك ئەسڵ داناوە، هەندێكی تریش كۆمەڵگە! بەڵام لە ئیسلامدا ئەو ململانێیە بوونی نییە و هاوسەنگی پارێزراوە لە نێوان تاك و كۆمەڵگەدا.

ئەگەر بڕوانییە یەهودییەت دەبینی ئەنانییەتێكی تەواو تەواو پەیرەو دەكرێت و تاك ئەسڵە. دواییش كە مەسیحیەت هات، ویستی تاك ڕزگار بكات لەپێش هەموو شتێك، هیچیان لایان بە لای كۆمەڵ و كۆمەڵگەدا نەكردەوە!

ئەگەر بڕوانییە ئەم سەردەمەش كە دوو ئاڕاستەی سەرەكی هەبوو لە جیهاندا:

**سەرمایەداری:** مافی تاكی زاڵ كرد و تاكی ئازاد كرد لەوەی چی دەكات با بیكات بۆ پەیداكردن و بەدەستهێنانی پارە، هەرچەند لەسەر حیسابی زیانگەیاند بێت بە خۆیی و بە ئەوانی تر. لەم لاشەوە شیوعییەت مافی خاوەنداری لە تاك سەندەوە و هیچ ئازادیەكی بۆ نەهێشتەوە، كەواتە سەرمایەداری لەبەر خاتری تاك كۆمەڵگەی پشتگوێ خست و شیوعییەتیش لەبەر خاتری كۆمەڵ و كۆمەڵگە تاكی پشت گوێ خست. بەڵام ئیسلام مافی هەردووكیانی بە هاوسەنگی پاراست و هیچ لایەكی نەگرت و یاسا و ڕێسای تۆكمەی دانا بۆ هاوسەنگی نێوانیان و پشتگوێ نەخستنی هیچ لایان.

ئیسلام مافی تاك و كۆمەڵی دیاری كردووە، ئێمە هەوڵدەدەین زۆر بەكورتی هەندێك لە مافەكانیان باس بكەین.



## مافـى تـاك

**١.** پاراستنى خوێن و ژيان و دانانى تۆڵه و سزا بۆ دەستدرێژيكاران، (مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنَّهُ مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا وَلَقَدْ جَاءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِالْبَيِّنَاتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَٰلِكَ فِي الْأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ).[١]

واتا: ((لەبەرئەوەی كارەساتی كوشتنی ناڕەوای ئاوا ڕوو نەدات، ئێمە پێویستمان كرد لەسەر نەوەی ئیسرائیل ئەوەی كەسێك بەناحەق بكوژێت و لەجیاتی ئەویش كوژراوێك نەبێت، یان گوناه و تاوانی گەورەی ئەنجام دابێت لەزەویدا (وەكوجەردەیی و دەستدرێژی و... هتد)، ئەوە وەك ئەوە وایە هەر هەموو خەڵكی كوشتبێت، ئەوەش كەسێك لە مەرگ ڕزگار بكات، هەروەك ئەوە وایە هەموو خەڵكی لە مەرگ ڕزگار كردبێت و ژیانی پێ بەخشیبن، سوێند بێت بە خوا بەڕاستی پێغەمبەرانمان بە بەڵگە و موعجیزەی ئاشكرا و دیارەوە هاتوون بۆ لایان (تا پابەندی حەق و داد بن) كەچی زۆربەیان دوای ئەو ڕێنموویيانە، هەر زیادەڕەو بوون لەم سەر زەمینەدا لە ستەم و كوشتنی ناحەقدا.))

**٢.** پاراستنی مافی نامووس و ڕێز و كەرامەت، (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِّنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ).[٢]

---

(١) [المائدة: ٣٢ ].

(٢) [الحجرات: ١٢].

واته: ((ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، خۆتان زۆر بپارێزن لە گومانی خراپ، لەڕاستیدا هەندێك لەو گومانانە گوناە و تاوانن (بۆیە حەق وایە لە هەموو گومانێك خۆپارێز بین) بەشوێن کەموکوڕیی و عەیب و عاری یەکتردا مەگەڕێن و سیخوڕی مەکەن و لەپاشملە باسی یەکتری بە خراپ مەکەن، ئایا کەستان خۆشی دێت لەوەی گۆشتی برای خۆی بەمردوویی بخوات؟! دیارە کاری واتان زۆر پێ سەخت و ناخۆشە، دەی کەواتە لە خوا بترسن و پارێزگار بن، چونکە بەڕاستی خوا گەڕانەوەی خەڵکی وەردەگرێت و میهرەبانە بۆتان.))

**٣.** پاراستنی ماڵ، مافی خاوەنداریەتی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) دەفەرمووێت: (إنَّ دِماءَكُم، وأمْوالَكم وأعْراضَكُم حرامٌ عَلَيْكُم كَحُرْمة يومِكُم هَذَا، في شَهرِكُمْ هَذَا، في بلَدِكُم هَذَا، ألا هَلْ بلَّغْت) متفقٌ عَلَيه. واتە ((خوێن و ماڵ و سامان و ناموستان لەسەر یەکتری حەرامە.))

**٤.** مافی ماڵ و شوێنی مانەوە و مافە کەسییەکان، (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَىٰ أَهْلِهَا ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ).[١]

واتە: ((ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، مەچنە هیچ ماڵێکی تر جگە لە ماڵەکانی خۆتان هەتا کارێك نەکەن کە ئەوان ئاگاداربن (وەکوو زەنگ لێدان یان لە دەرگادان) پاشان کە مۆڵەت دران، سەلام بکەن لە خەڵکی ماڵەکە، ئەوە چاکترە بۆتان و بەو شێوەیە ڕەفتار بکەن، هەوڵ

---

(١) [النور: ٢٧].

بدەن لە يادتان بێت و ئەو شێوازە فەرامۆش نەكەن. (كاتى لەبار و گونجاو هەڵبژێرن بۆ سەردانەكانتان، بۆ ئەوەى ميوان و خاوەن ماڵ دڵيان بەيەك بكرێتەوە.)))

**٥.** ئازادى بيروڕا و ئايين، (لا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ).[1]

واتە: ((بەهيچ جۆرێك زۆر كردن نييە لە وەرگرتنى بيروباوەڕى ئيسلامدا (ديندارى بەزۆر نابێت بكرێت و دين بەزۆر نادرێت بەسەر كەسدا).

(فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ).[2] واتە: ((جا ئەوەى دەيەوێت با باوەڕ بهێنێت و ئەوەى دەيەوێت با كافر و بێباوەڕ بێت.)).

كەواتە خوداى گەورە ڕێى داوە و سەرپشكى كردوون، هەروەها پێغەمبەريش (درودى خوداى لەسەر بێت.) ڕێى داون و لەگەڵياندا ژياوە و پەيمان و بەڵێنيشى لەگەڵدا بەستوون.

**٦.** ئازادى ڕەخنەگرتن و فەرمان بە چاكە كردن و ڕێگرى كردن لە خراپە، (وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ).[3]

((پێويستە لە ئێوە ئومەتێك پێك بێت، ياخود با هەمووتان ئومەتێك بن كە بانگەواز بكەن بۆ خێر و چاكە، فەرمان بدەن بە هەموو كارێكى باو و دروست، قەدەغەى هەموو نادروستييەك بكەن، ئا ئەوانە سەرفرازن.))

---

(١) [البقرة: ٢٥٦].

(٢) الكهف (٢٩).

(٣) [آل عمران: ١٠٤].

**٧.** ئازادى ڕادەربڕين و ئيجتيهادكردن، (إذا اجتَهَد فأصاب فله أجرانِ، وإن اجتَهَد فأخطَأَ فله أجرٌ.

إذا حَكَمَ الحاكمُ فاجْتَهَدَ ثُمَّ أصابَ فَلَهُ أجْرانِ، وإذا حَكَمَ فاجْتَهَدَ ثُمَّ أخْطَأَ فَلَهُ أجْرٌ.)[١]كەواتە بەم پێیە موجتەهید ئەگەر نەشیپێکێت ئەوە پاداشتێكى هەر هەیە، چونكە هەوڵیداوە و خۆى ماندووكردووە، ئەوە گەورترين هاندانە بۆ ئازادى بيروڕا و ڕادەبڕين و ئيجتيهادكردن.

**٨.** بەرپرسياريەتى تاكەكەسى، (كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ).[٢]چونكە لە قيامەتدا هەموو كەس بارمتەى دەستپێشكەرى خۆيەتى (كردەوەكانى دێنەوە ڕێى).

## ئەو ئەركانەى ئيسلام لەسەر كۆمەڵگەى داناون

**١.** ئەو پارێزگارييەى ئيسلام لە ژيانى تاكى كردووە لەكاتى پێويستى كۆمەڵگەدا دەبێ بكرێتە فيدا، واتە كۆمەڵگە لێرەدا پێش دەخرێت بەسەر تاكدا، يان بۆنموونە كوشتنى بەئەنقەست دەبێت تۆڵەى لێ بكرێتەوە، چونكە ئەگەر تۆڵە نەكرێتەوە ژيانى كۆمەڵگە دەكەوێتە مەترسيەوە و كەس حيساب بۆ كەس ناكات وەك ئێستا، يان دەستى دز دەبڕدرێت چونكە ئەگەر وا نەبێت كۆمەڵگە لێكهەڵدەوەشێت و دزى دەبێتە دياردە.

**٢.** مافى خاوەندارى و ماڵ و سامان ڕەها نييە وەك سەرمايەدارى، بەڵكوو مەرجدارە بە چەند مەرجێك بۆ ئەوەى لەو نێوەندەدا مافى

---

(١) متفق عليه.

(٢) [المدثر: ٣٨].

كۆمەڵگە پێشێل نەكرێت، یان زەكات وەردەگیرێت بۆ هەژاران بۆ ئەوەی هاوسەنگی بگەڕێتەوە، یان نابێت كەسەكە ئەو ماڵ و سامانە لە شتێك بەكار بێنێت كە ببێتە هۆی لەناوبردن و لێكهەڵوەشانی كۆمەڵگە.

**٣.** ئازادییەكان نابێت لەسەر حیسابی كۆمەڵگە بن، چونكە هەموو ئازادییەك سنووری هەیە و هەركاتێك بێسنوور بوو، ئەوە بەدڵنیاییەوە سنووری یەكێكی تر دەبەزێنێت.

**٤.** تاك بەرپرسیارە بەرانبەر كۆمەڵگە، دەبێت بە حیكمەت و داناییەوە فەرمان بە چاكە بكات و ڕێگری لە خراپە بكات، سەرەتا بە دەست و كردەوە پاشان بە زمان پاشان بە دڵ.

**٥.** شتێكمان هەیە لە فیقهی ئیسلامیدا پێی دەوترێت فەڕزی كیفایە، واتە خودی خۆی واجبە لەسەر هەموو كۆمەڵگە نەوەك تاك تاكی كۆمەڵگە، هەر بۆیە ئەگەر هەندێك پێی هەستان لەسەر ئەوانی تریش لادەچێت، بۆنموونە زانستی پزیشكی یان تەكنەلۆجی یان زانستە شەرعییەكان، بۆیە لێرەدا ڕەچاوی كۆمەڵگە كراوە.

**٦.** عیبادەت و پەرستش و دروشمەكانیش پڕیانە لە ماناكانی كۆمەڵ و كۆمەڵگە، بۆنموونە نوێژ و نوێژی جەماعەت و بەكۆمەڵ و جومعە و جەژنەكان و قوربانیكردن و چەندانی تر. هەتا ئەگەر بڕوانییە دەستەواژەكانی ناو نوێژیش، ئەوە بەدی دەكەیت، دەبینی ڕووحی ئەنانییەت و خۆخۆیی دەكوژێت، ئەوەتا دەفەرمووێت: (إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ).[1] واتە: خوایە، تەنها هەر تۆ دەپەرستین و هەر لە

---

(١) الفاتحة (٥).

تۆش داوای یارمەتی و پشتیوانی دەکەین (لە کاروباری دین و دنیاماندا و بە کەسی تر لە بەندەکانت ناکرێت)، ناڵێین تۆ دەپەرستم و داوای یارمەتی لە تۆ دەکەم، بەڵکوو دەڵێین: تۆ دەپەرستین و داوای یارمەتیش هەر لە تۆ دەکەین.

بە هەمان شێوە دەفەرمووێت: (اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ).[١] واتە: خوایە بەردەوام ڕێنموویمان بفەرموو بۆ ئەم ڕێبازە ڕاست و دروستە کە ئیسلامە.

لە هەموو نوێژێکدا فێری ئەوە دەکرێین بەیەکەوە بین و دووربین لە خۆپەرستی و خۆخۆیی، کەواتە ئەوەیە مانای کۆمەڵ و کۆمەڵگەییبوون.

**٧.** ئاداب و تەقالید و ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان، ئەگەر بڕوانینە ئەم شتانە هەموویان پڕیانە لە مانای کۆمەڵ و کۆمەڵگەییبوون، سەیری سیلەی ڕەحم و سەردانی نەخۆش و یارمەتیدانی هەژاران و نەداران و ڕێبواران و... بکە، لە هەموویاندا کۆمەڵگەییبوون دەدرەوشێتەوە.

**٨.** لەبواری ڕەوشتیش ئیسلام هانی خۆشەویستی، برایەتی، یارمەتیدان، لێبوردەیی، سۆز، ڕێزگرتن و هەموو ڕەوشتە باشەکانی داوە، لە هەموویاندا ڕووحی کۆمەڵگەییبوون دەدرەوشێتەوە.

کەواتە دەرکەوت ئیسلام لە بواری تاکە کەسی و گشتیشدا میانڕەو و ناوەندگیرە.

---

(١) الفاتحة (٦ ).



## واقیعیبوونی ئیسلام (الواقعیة)



واقیعیبوونی ئیسلام بەسەر هەموو کایەکانیدا دەدرەوشێتەوە: عەقیدە، ڕەوشت، شەریعەت، عیبادەت.

واقیعیبوونی ئیسلام، واتە هاتنەوە لەگەڵ واقیع و تێکنەگیران لەگەڵیدا.

### ١. واقیعیبوونی ئیسلام لە ڕووی عەقیدە و بیروباوەڕەوە

واقیعیبوونی ئیسلام لە ڕووی عەقیدەوە شتێکی حاشا هەڵنەگرە، بڕوانە باوەڕبوون بە خودا و بە پێغەمبەر و بە ڕۆژی دوایی، هەموویان تەواو لەگەڵ واقیعدا دێنەوە و هیچ تێکگیرانێك نییە لە نێوان ئەمانە و واقیعدا، ئێمە بەدرێژی باسی بەڵگە عەقڵییەکانمان کرد لەسەر ئەم بابەتانە، هەر بۆیە باوەڕنەبوون بەمانە شتێکی ناواقعییە نەوەك بە پێچەوانەوە.

### ٢. واقیعی بوونی ئیسلام لە ڕووی عیبادەتەوە

سەیری هەموو عیبادەتەکان بکە واقیعی بوونیان لێ دەچۆڕێت، لەگەڵ ئەمانەشدا ڕەچاوی بارودۆخی کەسەکان کراوە.

بۆنموونە ئەگەر نەتتوانی بە هەستانەوە نوێژ بکەی، بە دانیشتنەوە دەتوانی. ئەگەر بەدانیشتنەوە نەتتوانی، لەسەر لاتەنیشت دەتوانی. ئەگەر واش نەتتوانی، لەسەر پشت. ئەگەر هەر نەتتوانی، بە جووڵەی چاوەکان.

یان ڕۆژوو، ئەگەر پیر و پەککەوتە بوو و نەیتوانی، یان نەخۆش بوو، یان لە گەشت بوو؛ دەتوانێت ڕۆژوو نەگرێت.

یان ئەگەر پارەی حەجی نەبوو، حەجی لەسەر نییە.

یان ئەگەر لە گەشت بوو، دەتوانێت نوێژ کورت و کۆ بکاتەوە.

یان ئەگەر ناچار بوو، دەتوانێت گۆشتی بەراز یان مردارەوەبوو بخوات.

یان...

## واقیعیبوونی ئیسلام لە ڕووی ڕەوشتەوە

ئیسلام لە ڕووی ڕەوشتیشەوە تەواو تەواو واقعییە و شتێکی تێدا نییە دژ بوەستێت لەگەڵ واقیعدا، بڕوانە دانە دانەی ڕەوشتە دانپێدانراوەکان لە ئیسلامدا، هەموویان واقیعیبوونیان لێ دەچۆڕێت، ڕاستگۆیی، متمانە و ئەمانەتپارزی، خۆشەویستی، دڵسۆزی،...

وەك مەسیحییەت نییە کە قسەیەکی بەناوبانگیان هەیە دەڵێت: ئەگەر لەلای ڕاستیان دای لای چەپیشیان بۆ دانێ، یان ئەگەر کراسەکەتیان برد پانتۆڵەکەشت پێیان بدە!

نەخێر لە ئیسلامدا هەمووی بە هاوسەنگییە و هەموو شتێك بە ئەندازەی خۆیەتی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕەچاوی باردۆخەکانی کردووە، بۆنموونە ناڕاستی وتن بۆ ئاشتەوایی و ڕزگارکردنی گیانی مرۆڤ دروستە و بە درۆ هەژمار ناکرێت.

## واقيعيبوونی ئیسلام لە ڕووی پەروەردەوە

ئیسلام قۆناغەكانی ژیانی مرۆڤی ڕەچاو كردووە و ئاستەكانی لەیەك جیاكردۆتەوە، قۆناغی منداڵی جۆرێكە و قۆناغی گەنجی و پیریش جۆرێكی تر، ناكرێت هەموویان بەیەك چاو سەیر بكرێن، بۆیە ئەرك و مافەكانی بەپێی ئاست و كەسەكان داناوە و پەروەردەی هەموویانی لەیەك جیاكردۆتەوە.

## واقيعيبوونی ئیسلام لە ڕووی تەشریع و یاسا و شەریعەتەوە

**١.** شەریعەتی ئیسلامی شتێكی حەرام نەكردووە مرۆڤ پێویستی پێبێت.

**٢.** شەریعەتی ئیسلامی شتێكی حەڵاڵ نەكردووە زیانبەخش بێت.

**٣.** شەریعەتی ئیسلامی هەندێك شتی حەرامی حەڵاڵ كردووە لەكاتی ناچاریدا، بۆنموونە خەریكە دەمرێت لە برسا و بەس گۆشتی بەراز یان مردارەوەبووی لایە، بۆی هەیە بیخوات.

**٤.** واجبەكانی لابردوون یان سووكی كردووە لەسەر كەسی حامیلە و حەیزدار و نەخۆش و...، وەك كورتكردنەوە و كۆكردنەوەی نوێژ لە سەفەردا، چونكە سەفەر ناڕەحەتی تێدایە.

**٥.** چەند ژنی بە شەرت و مەرج و ڕێ و شوێنی خۆی ڕێپێدراوە چونكە هەندێك حاڵەت هەیە پێویستی بەمەیە.

**٦.** تەڵاقی داناوە، چونكە زۆر جار تەڵاق باشترە لە مانەوەی ئەم گرێبەستە.

**٧.** سزا و حەدد و تەمبێكردنی داناوە بۆ سەرپێچیكاران، كە دیارە ئەمەش هەمووی بۆ پاراستنی سەر و ماڵ و نامووس و ڕەوشتی خەڵكە.

بۆیه لەکۆتاییدا دەتوانین بە دوو خاڵ زیاتر واقیعیبوونی ئیسلام ڕوون بکەینەوە:

**١.** ئاسانکاری و لابردنی هەموو ناڕەحەتییەك، بەشێوەیەك هەمووی لە توانای مرۆڤدایە و هەر کاتێکیش مرۆڤ نەیتوانی بیکات، یان لەسەری لادەبات، یان لەسەری سووك دەکات.

**٢.** ڕەچاوکردنی پلەبەندی، بۆنموونە نوێژ لەسەرەتادا دوو ڕکات بوو، یان عەرەق کە بە چوار قۆناغ حەرامکرا.

کەواتە دەرکەوت ئیسلام واقیعییە و دژی ناواقیعییە.

# گشتگیری ئیسلام (الشمول)

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئیسلام گشتگیرییە، واتە گشتگیرە بۆ هەموو بوارەکان و هەموو کایەکان، هەم ئیمانە هەم عەمەل، هەم عەقیدەیە هەم شەریعەت و یاسا، هەم عیبادەتە و هەمیش مامەڵە، هەم فکرە هەم عاتیفە و سۆز، هەم ڕەوشتە هەم ئاوەدانکردنەوە، هەم سەروەت و سامانە هەم ئابووری، هەم سیاسەتە هەم ڕۆشنبیری،...

کەواتە ئیسلام بریتییە لە: پەیامێکی خوایی و سیستمێکی گشتی و یاسایێکی گشتگیر بۆ مرۆڤ و خێزان و کۆمەڵگە و گەل و نەتەوە و دەوڵەت و مرۆڤایەتی و جیهان. کار لەسەر هەرسێ بەشەکەی مرۆڤ دەکات «عەقڵ و ڕووح و جەستە»، یان بڵێین (عەقڵ، بیر، ناخ، ڕووح، خوڕەوشت، کردار، گوفتار و مامەڵە)، بەشێوەیەك هەوڵ دەدات ڕێنماییەکی تەواو و ڕێکوپێك و جوانی هەموو ئەم بەشانە بکات و ناتەواوی و ناشیرینی ئەو بەشانە نەهێڵێت و لەسەر فیترەت بیانهێڵێتەوە و پەروەردەیان بکات، بەشێوەیەك کە لە خزمەت مرۆڤ و مرۆڤایەتی و خوای گەورەدا بەکاریان بێنێت و دونیا و دواڕۆژیان پێ ڕووناك بکاتەوە. ئینجا کە مرۆڤێکی بەم شێوە جوانە پەروەردە کرد، ڕاستەوخۆ خێزان و کۆمەڵگە و گەل و نەتەوە و دەوڵەت و جیهان باش پەروەردە دەبێت و دەکەونە سەر ڕێڕەوێکی دروست و هاوسەنگ.

ئیسلام پەیامی هەموو سەردەم و کاتەکانە، پەیامی هەموو شوێن و ژینگەکانە، پەیامی هەموو کایەکانی ژیانە، پەیامی هەموو قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤە، پەیامی هەموو جیهانە، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموویت: (وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ).[1] واتە: ((ئەی محمد (دروودی خوای لەسەر بێت.)، ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە ببیتە ڕەحمەت و بەرەکەت بۆ هەموو جیهان (بۆ ئادەمیزاد و گیاندار و ڕووەك و پەری و... هتد))).

هەروەها دەفەرموویت: (قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا).[2] واتە: ((ئەی محمد(دروودی خوای لەسەر بێت.)، بڵێ: ئەی خەڵکینە بەڕاستی من پێغەمبەر و فرستادەی خوام بۆ ئێوە بەگشتی.))

گشتگیری ئیسلام واتە لەخۆگرتنی: عەقیدە و عیبادەت و ڕەوشت و تەشریع. چونکە ئێمە وتمان مرۆڤ لە سێ بەش پێك دێت: عەقڵ و ڕووح و جەستە، یەکەم بەش کە عەقڵە ئیسلام پەیامی بۆی هەیە، ئیسلام بەرنامەیەکی تێروتەسەل و جوانی هەیە بۆ ڕێنموونی عەقڵ و هزر و بیر, وەڵامی تەواوی پێیە بۆ پرسیارە عەقڵی و فکری و فەلسەفییەکان بەشێوەیەك هیچ شتێك نابینی لە بنەما نەگۆڕەکانی ئیسلام کە لەگەڵ عەقڵ تێکبگیرێن. بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە ئیسلام بەرنامە و وەڵامی تەواوی پێیە قورئان و سوننەتە، هەروەها هەبوونی زانستێکی گرنگ و فراوان بە ناوی زانستی بیروباوەڕ (علم العقیدة

---

(١) [الانبیاء: ١٠٧].

(٢) [الاعراف: ١٥٨].

الإسلامية) هەروەها هەبوونی فکر و هزر و فەلسەفەی ئیسلامی، کە هەر یەکێکیان بە سەدان و هەزاران پەرتووکی لەبارەیەوە نووسراوە، بۆیە هیچ بابەتێکی عەقیدەیی و فکری و فەلسەفی و زانستی نابینی کە زانایان و بیرمەندان و فەیلوسوفان لێی نەدوابن و پەرتووك و توێژینەوەیان لەبارەیەوە نەنوسیبێت. هەروەك لە ئیسلامدا ڕێگری لە بیرکردنەوە و عەقڵ بەکارهێنان نەکراوە، بەڵکوو فەرمانی پێکراوە، هەروەها هەموو شتێك کە زیان بە عەقڵ و بیر و هۆش بگەیەنێت یاساغ و حەرام کراوە بۆنموونە: مادده هۆشبەرەکان. کەواتە ئیسلام بەشە سەرەکییەکەی مرۆڤی پشتگوێ نەخست کە بریتییە لە عەقڵ.

## گشتگیری عەقیدە:

عەقیدە و بیروباوەڕی ئیسلامی لە چەند ڕوویێکەوە گشتگیرە:

**١.** گشتگیرە، چونکە وەڵامی پێیە بۆ پرسیار و بابەتە گرینگ و گەورەکانی: ژیان، گەردوون، مرۆڤ، خودا، دوارۆژ و سەرەنجام و مەسیر، لەکوێ هاتووم؟ بۆچی هاتووم؟ بۆ کوێ دەچم؟

**٢.** گشتگیرە، چونکە سەرچاوەکەشی کورت هەڵنەهاتووە لە شتێکی دیاریکراوی وەك هەست و شعور و ویژدان وەك ئەوەی لە مەسیحیەتدا هەیە، یان بەس لە عەقڵ وەك زۆربەی فەلسەفەکان و عەقڵگەراکان، یان بەس ئەزموون و مادده وەك ماددیگەراکان. ئیسلام پشت دەبەستێت بە فکر و شعور بەیەکەوە، دڵ و عەقڵ بەیەکەوە و لەیەکیان جیاناکاتەوە، بەڵکوو هەم عەقڵ و هەم شعور و دڵ، هەم ئەزموون و گەردوون، هەم هەواڵی ڕاست و وەحی سەرچاوەی بیروباوەڕن، هەر



بۆیه ئیمان له ڕۆشنایی عەقڵ و گەرمی دڵەوە سەرچاوە دەگرێت نەوەك كورتهەڵێنانی لەیەك شتدا.

**٣.** بیروباوەڕی ئیسلامی گشتگیره، چونكه قەبووڵی بەش بەش كردنی نییه، ناكرێت بڕوات به خودا هەبێت بەڵام بڕوات به پێغەمبەران نەبێت، یان به ڕۆژی دوایی، یان...

## گشتگیری ئیسلام له ڕووی پەرستش و عیبادەتەوە

پەرستش و عیبادەت له ئیسلامدا گشتگیره و مەفهومەكەی زۆر فراوانه بەشێوەیەك هەموو كیان و كایەكانی ژیانی مرۆڤ دەگرێتەوە، هەر شتێك كه دەیكات بەس دڵسۆز بێت و كارێكی باش بێت و به نییەتێكی باش بیكات هەرچەنده عادەت و مامەڵەش بێت دەبێته پەرستش و عیبادەت! مرۆڤ به زمان و به دڵ و به جەسته و به فكریش دەتوانێت عیبادەت بكات!

به زمان: زیكر و قورئان خوێندن و وته و قسەی جوان و سوودبەخش و...

به جەستەی: سوجده و ڕوكوع و ڕاوەستان و مامەڵەی جوان و یارمەتیدانی خەڵك و...

به بیر و فكری: بیر له دروستكراوەكان بكاتەوە و بیر له گەورەیی و بەزەیی و سیفاتەكانی خودا بكاتەوە یان زانست بەدەستبهێنێت و بیگەیەنێت.

به دڵ و ناخی: خودا و مرۆڤه باشەكانی خۆش بوێت و ڕقی له شته خراپەكان ببێتەوە.

كەواتە پەرستش و عیبادەت زۆر فراوان و گشتگیرە و هەموو كایەكانی مرۆڤ و ژیان دەگرێتەوە بە شێوەیەك هەموو هەڵسوكەوت و مامەڵە جوانەكانیش هەرچەند بۆ ژیانی دونیاش بن مادام باش و سوودبەخشن دەچنە ناو چوارچێوەی پەرستش و عیبادەتەوە.

لێرەدا پێم باشە باسێكی كورتی نوێژ و فەلسەفەكانی بكەم، وەك عیبادەتێكی گشتگیر و كاریگەر، چونكە نوێژ وەك كۆڵەكەی دین فەلسەفەی زۆر زۆری هەیە:

**١.** پاك و خاوێنی، مەعلومە نوێژ بەبێ پاكژی دروست نییە، بۆیە دەبێت جەستە و جلوبەرگ و شوێن و ئاوەكەشی پاك و خاوێن بێت، كەواتە نوێژ بەهێزترین پاڵنەرە بۆ خۆپاكڕاگرتن و پاكژی و دووربوون لە پیسی و پۆخڵی، هەروەها لە ڕێی خۆشۆردن و دەستنوێژەوە وا لە مرۆڤ دەكات هەمیشە و بەردەوام پاك و خاوێن بێت.

**٢.** بەرگری و مەناعەیەكی زۆر بەهێزە دژی تاوان و گوناە و خراپەكاری, چونكە خودای گەورە دەفەرموێت: (وَأَقِمِ الصَّلَاةَ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ)[١]. واتا: ((نوێژ نەهێت لێدەكات و دوورت دەخاتەوە لە گوناە و تاوان و خراپەكاری.)) كەواتە گەورەترین فەلسەفەی نوێژ دوورخستنەوەی مرۆڤە لە گوناهو تاوان.

**٣.** پەیوەندیكردنە بە پەردگار، پەیوەندی نەبڕانە پێیەوە، چونكە (صلاة) ئەو صەلاتەیە لە نێوان نوێژەكانیشدا صیلەت لەگەڵ خودای گەورەدا نەپچڕێت.

---

(١) [العنكبوت: ٤٥].

**٤.** پەیوەستبوونی هەموو کیانی مرۆڤ بە خوداوە، لە نوێژدا هزر و عەقڵ و دڵ و دەروون و زمان و لاشە و هەست و نەست هەمووی پەیوەست دەبەستێت بە خوداوە، بۆیە نویژ بەشی هەموویانی تێدایە ئەگەر مرۆڤ بە دوایاندا بگەڕێت.

**٥.** بەردەوامییە، چونکە لە هەموو نوێژێکدا دەڵێیت: (اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ) [الفاتحة: ٦]

خودایە بەردەوام ڕێنموییمان بفەرموو بۆ ئەم ڕێبازی ڕاست و دروستی ئیسلامە.

**٦.** بەبیربوونی پێشەنگەکان و لەبیرنەکردنیان، چونکە لە هەموو نوێژێکدا دەڵێیت: (صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ).

**٧.** شوێنکەوتنی سیمبول و پێشەوایان و پێغەمبەران، چونکە لە هەموو نوێژێکدا دەڵێیت: (صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ).

**٨.** خۆپەنادان لە هەموو خەراپەکاران و بێباوەڕان، چونکە لە هەموو نوێژێکدا دەڵێیت: (غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ).

**٩.** پشتبەستنی تەواو بە خودای گەورە، چونکە لە هەموو نوێژێکدا دەڵێیت: (وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ).

خودایە، تەنها هەر تۆ دەپەرستین و هەر لە تۆش داوای یارمەتی و پشتیوانی دەکەین (لە کاروباری دین و دونیاماندا، بە کەسی تر لە بەندەکانت ناکرێت). دیارە ئەوە بۆ (حصر)ە واتا بەس داوای یارمەتی لە تۆ دەکەین.



**١٠.** تەوحید و یەکتاپەرستی تەواو، چونکە لە هەموو نوێژێکدا دەڵێیت: (إِيَّاكَ نَعْبُدُ) خودایە، تەنها و تەنها هەر تۆ دەپەرستین. دیارە ئەوە بۆ (حصر)ە واتا بەس تۆ دەپەرستین و هاوەڵ و شەریکت بۆ بڕیارنادەین.

**١١.** سوپاسگوزاری بەردەوام، چونکە لە هەموو نوێژێکدا دەڵێیت: (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ)

سوپاس و ستایش هەر شایستەی خودایە و بۆ خودایە، کە خاوەن و پەروەردگاری هەموو جیهانیان و هەموو بوونەوەرە.

**١٢.** جێگیرکردن و ئیسپاتکردنی بنەمای کردەوەکانی دڵ، چونکە بنەماکانی کردەوەی دڵ سێن: ( حب، رجاء، خوف)، «خۆشەویستی خودای گەورە، ڕەجا و تەمابوون بە خودای گەورە، ترسان لە خودا»، کە دیارە بەردەوام لە هەموو نوێژێکدا دەڵێیت: (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) ئەوە بۆ خۆشەویستی، (الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ) ئەوەشیان بۆ ڕەجا و ئومێد، (مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ) ئەوەشیان بۆ ترس.

**١٣.** جێگیرکردن و ئیسپاتکردنی ناو و سیفەتەکانی خودای گەورە، چونکە لە هەموو نوێژێکدا سیفەتەکانی خودای گەورە دەڵێیەوە، (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ)، (الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ)، (مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ).

**١٤.** ئەدەب و ڕەوشت، چونکە لە هەموو نوێژێکدا سەرەتا وەسفی خودای گەورە دەکەی و پەیمانی تەوحید و تەوەکول دەدەی ئینجا دێییە سەر داواکارییەکان، سەرەتا دەڵێیت: (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ)، (الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ)، (مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ)، (إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ).

ئینجا دێی داواکارییەکان دەکەی و دەڵێیت: (اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ).

خودایە بەردەوام ڕێنموویمان بفەرموو بۆ ئەم ڕێبازی ڕاست و دروستی ئیسلامە.

(صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ).

کە بەرنامە و ڕێبازی ئەوانەیە لە ناز و نیعمەتی خۆت بەهرەوەرت کردوون، نەمانخەیتە سەر ڕێبازی ئەوانەی خەشم و قینیان لێگیراوە (بەهۆی ئەوەوە دەیزانن و لایانداوە)، هەروەها نەمانخاتە سەر ڕێبازی ئەوانەش، کە سەرگەردان و گومڕان (بەهۆی لاساری و یاخیبوون و نەزانینیانەوە).

**١٥.** کوشتنی ئەنانییەت و خۆخۆیی، چونکە لە دوعاکاندا بۆت نییە بە تەنها بیانڵێیت و تەنها خۆت لە بیربێت، بۆیە لە هەموویاندا دەڵێێت: (إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ).

خودایە، تەنها هەر تۆ دەپەرستین و هەر لە تۆش داوای یارمەتی و پشتیوانی دەکەین (لە کاروباری دین و دنیاماندا، بە کەسی تر لە بەندەکانت ناکرێت).

(اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ) خودایە بەردەوام ڕێنموویمان بفەرموو بۆ ئەم ڕێبازی ڕاست و دروستی ئیسلامە. لە هەموویاندا بە سیغەی جەمع هاتووە.

**١٦.** لە بیرنەکردنی برا و خوشکەکان و باسکردنیان بە بەردەوامی، بۆیە لە هەمویاندا داوا بۆ ئەوانیش دەکەیت، ئەگەر تەنها داوا بۆخۆت بکەی نوێژەکەت بەتاڵە، وەك دەڵێێت:

(إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ)

خودايه، تەنها هەر تۆ دەپەرستين و هەر لەتۆش داواى يارمەتى و پشتيوانى دەكەين (لە كاروبارى دين و دنياماندا، بەكەسى تر لە بەندەكانت ناكرێت).

(اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ)

خودايه بەردەوام ڕێنموویيمان بفەرموو بۆ ئەم ڕێبازى ڕاست و دروستى ئيسلامە. هەمووى بە سيغەى جەمعە.

**١٧.** لە بيرنەكردنى قورئان و لەبيربوونى قورئان و ژيان لەگەڵ قورئان بە بەردەوامى، چونكە لە هەموو نوێژێكدا دەيخوێنيت.

**١٨.** گوێگرتنى بەردەوام بۆ قورئان.

**١٩.** لەبەركردنى قورئان، بەهێزترين هۆكار بۆ لەبەركردنى قورئان نوێژە، ئەگەر نوێژ نەبايە (حافظ القران) ەكان قورئانەكەيان بيردەچۆوە.

**٢٠.** تێگەيشتن و وردبوونەوە لە قورئان، چونكە بەردەوام لە نوێژدا قورئان دەخوێنێت و گوێى بۆ دەگرێت.

**٢١.** ڕاهاتن لەسەر بيركردنەوە لە گەردون، وەك هەموو جارێ دەيخوێنيت: (رَبِّ الْعَالَمِينَ)، پەردگارى جيهانيان و هەموو بوون و مەخلوقات.

**٢٢.** ملكەچى، چونكە هەموو حەرەكات و سەكانەتى نوێژ بە ڕاوەستان و دەستگرتن و ڕوكوع و سوجود، هەمووى پڕيەتى لە تەوازوع و نەهێشتنى تەكەببور.

**٢٣.** به گەورە دانانی خودای گەورەیە، چونکە کە ئیماندار نوێژدەکات و سوجدە دەبات ئەوە بۆ خۆی بەهێزترین بەگەورە دانانی خودای گەورەیە، چونکە ئیمانداری ڕاستەقینە هەموو دونیای بدەرێ ئامادە نییە سوجدە بۆ غەیری خودای گەورە بەرێت.

**٢٤.** وەڵامدانەوەی بانگهێشتکردنی خودای گەورەیە، کە بانگدەدرێت هۆ خەڵکینە وەرن بۆ نوێژ وەرن بۆ سەرفرازی واتا وەرن بۆ موناجاتکردن لەگەڵ خودای گەورە. کەواتە کە نوێژت ئەنجامدا، واتا وەڵامی بانگهێشتی خودای گەورەت دایەوە.

**٢٥.** گوێڕایەڵی خودای گەورەیە، بنەمای هەموو عیبادەتەکان بریتییە لە گوێڕایەڵی، هەر خودی عیبادەت واتا گوێڕایەڵی بۆ خودای گەورە.

**٢٦.** وەرزشێکی جەستەییە، نوێژ بە ناچاری وەرزشت پێ دەکات و حەقی جەستەت پێ جێبەجێ دەکات.

**٢٧.** وەفایە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.)، بە گەورە دانانیەتی، خۆشەویستی دەربڕینە بۆی، کاتێك ئەوە لە هەموو نوێژێکدا دەڵێیت: اللهم صل على محمد وعلى آل محمد.

**٢٨.** بە پاك دانانی خودای گەورەیە، ئەوەتا لە هەموو نوێژێکدا دەڵێیت: سبحان ربي الله العظيم، سبحان ربي الأعلى.

**٢٩.** وەفایە بۆ باوکی پێغەمبەران ابراهیم (علیه السلام)، مانەوەی ناویەتی و باسکردنییەتی بە بەردەوامی، ئەوەتا لە هەموو نوێژێکدا دەڵێیت: (كما صليت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم).



**٣٠.** باسکردن و لە بیرنەکردنی ڕۆژی دوایی، ئەوەتا لە هەموو نوێژێکدا دەڵێیت: (مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ)

خاوەن و سەرداری ڕۆژی پاداشت و سزایە.

**٣١.** دانەبڕانە لە گەردوون و مەخلوقات، چونکە هەمووی ملکەچی خودای گەورەریە و تەسبیحاتی خودای گەورە دەکات.

**٣٢.** گەورەترین ڕێگەی ئازادییە، چونکە کە سوجدەت برد و ملکەچی خودای گەورە بووی واتا عیبادەت و ملکەچی غەیری خودای گەورەت ڕەتکردۆتەوە و خۆپەرستی و مرۆڤپەرستی و ماددەپەرستیت ڕەتکردۆتەوە.

**٣٣.** داواکردنی پاداشت و ڕەحمەتە و خۆپاراستنە لە سزای خودای گەورە.

**٣٤.** بەردەوامی دوعا و ڕاهاتن لەسەری، چونکە وەك نموونەمان هێنایەوە نوێژ پڕیەتی لە نزا و پاڕانەوە و لاڵانەوە.

**٣٥.** چوستی و چالاکی و قەلب سووکی، چونکە لە کاتە جیاوازەکاندا هەڵتدەستێنێت و ڕاتدەپەڕێنێت.

**٣٦.** ڕێکخستنی کاتەکان، فێرت دەکات کاتەکانت ڕێکبخەی، چونکە بۆخۆی کاتەکانی ڕێکخراون، بۆیە دەوترێت دوای نوێژی بەیانی، یان پێش نوێژی نیوەڕۆ، یان ئەوانی تر.

**٣٧.** تەندروستی و سەلامەتی، نوێژ هەم بە پاڵنەرەکانی بۆ پاکوخاوێنی هەم بە هەڵستاندت لە خەو هەم بە حەرەکات و سەکەناتەکانی



تەندرستت دەكات، بۆنموونە وەك پزیشكەكان دەڵێن: زۆرێك لە جەڵدەكان لە پێش نوێژی بەیانییەوەن، بۆیە كە تۆ هەستای لە خەو ئەگەری تووش بوونت بە جەڵدە كەم دەبێتەوە، یان كە خۆت پاككردەوە دوور دەبی لە زۆرێك لە نەخۆشییەكان.

**٣٨.** ڕێكخستنی خەو، بۆیە زۆر جار ناچاری شەو زوو بخەوی بۆ ئەوەی خەبەرت بێتەوە بۆ نوێژی بەیانی.

**٣٩.** ناردنی سەلام و ئاشتییە بۆ هەموو مرۆڤەكان، بۆیە دەڵێیت: السلام علیكم ورحمة الله وبركاته.

**٤٠.** تاقی كردنەوەی خودای گەورەیە، بۆ ئەوەی بزانرێت كێ وەڵامی خودای خۆی دەداتەوە.

**٤١.** یەكسانییە، ئەوەتا دەوڵەمەند و هەژار، دەستەڵاتدار و بێدەستەڵات، بەبێ جیاوازی و بە یەك شكڵ و شێوە نوێژ ئەنجام دەدەن و ڕادەوستن.

**٤٢.** برایەتییە، ئەوەتا لە تەنیشت یەك ڕادەوستن و دڵ و قاچ و شانیان ناوە بەیەكەوە و بێ جیاوازی وەستاون.

**٤٣.** ئاگالێكبوون و دانەبڕانە لە یەكتری، ئەوەتا یەك نوێژ نوێژخوێنێك دیارنەبێت لە مزگەوت خەڵكی دەڵێن: ئەوە فڵانە كەس بۆ دیارنییە؟ لەكوێیە؟

**٤٤.** زانكۆیەكی كۆمەڵاتییە، ئەوەتا بەهۆی نوێژەوە مزگەوت دەبێت بە شوێنێكی كۆمەڵایەتی.

لەگەڵ زۆری دیکە ....

کەواتە هەر عیبادەتێك بگری ئیللا دیوێکی مرۆیی و ئینسانی هەیە، هەموو عیبادەتەکان پڕن لە فەلسەفە و حیکمەت و سوود بۆ تاك و خێزان و کۆمەڵگە و مرۆڤایەتی.

## گشتگیری ڕەوشت

ئیسلام بەرنامەیەکی تێروتەسەل و جوانی هەیە بۆ ڕێنموونی کردن و ئاراستەکردنی ڕووح و دڵ و دەروون و ڕەوشت، ناتەواوی و ناڕێکی و بۆشاییەکانی بۆ پڕدەکاتەوە، بۆیە هیچ شتێك نابینی لە ئیسلامدا کە لەگەڵ ڕووح و ناخ و دڵ و دەروون و فیترەت و خوڕەوشت و ئاکاری مرۆڤدا نەگونجێت و تێکبگیرێت. بەڵگەش لەسەر ئەمە قورئان و سوننەتە، هەروەها هەبوونی زانستێك بە ناوی زاستی پاککردنەوەی ڕووح و دڵ و دەرون (علم تزكية النفس) یان زانستی ڕەوشت (علم الاخلاق)، کە ئیش دەکات لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ خۆی بڕازینێتەوە بە هەموو خوڕەوشت و سیفەتێکی جوان و باش لە ناوەوەو لە دەرەوەی خۆیدا و دوورکەوێتەوە لە هەموو ڕەوشت و سیفەتێکی ناشیرن و خراپ لە ناوەوە و لە دەرەوەی. کەواتە ئیسلام ئەو بەشە سەرەکییەی تری مرۆڤی پشت گوێ نەخست و گرنگییەکی تەواوی پێ داوە و ڕێنمایی تەواوی کردووە و بۆشاییەکانی پڕ کردوەتەوە و هیچ شتێکی تێدا نییە کە تێکبگیرێ لەگەڵیدا، بۆیە ئەو بەشەش کە جوان و ڕێکوپێك بوو ڕاستەوخۆ ڕەنگدانەوەی ئەرێنی و جوان و باشی دەبێت لەسەر گوفتار و ڕەفتار.

## چەند نموونەیەك لە گشتگیری ڕەوشتی ئیسلامی

### ١. ڕەوشتی ئیسلام بۆ تاك لە هەموو ڕووەكانەوە:

**أ.** لە ڕووی جەستە و پێداویستییەكانییەوە، خوای گەورە دەفەرمووێت: (يَا بَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلَا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ).(١) واتە: ((ئەی نەوەی ئادەم، خۆتان بڕازێننەوە بە پۆشاك لەبەركردن، لەكاتی هەموو نوێژێك و چوونە ناو مزگەوتدا، بخۆن و بخۆنەوە (لە ناز و نیعمەتەكان) بەڵام زیادەڕەوی مەكەن، چونكە بەڕاستی خوا لەسنووردەرچووان و زیادەڕەوانی خۆش ناوێت.))

هەروەها پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) دەفەرمووێت: (إنَّ لنَفْسِكَ (أو بدنك) عليكَ حقًّا)(٢). واتە: نەفس و جەستە مافی بەسەر تۆوەیە.

**ب.** لەڕووی عەقڵەوە: (قُلِ انظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا تُغْنِي الْآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ).(٣) واتە: ((پێیان بڵێ: سەیر بكەن و سەرنج بدەن: خوا چی دروستكردووە لە ئاسمانەكان و زەویدا، كەچی بەڵگە و نیشانەو ئاگادارییەكان سوودیان نییە بۆ ئەو كەسانەی كە باوەڕ ناهێنن و (ڕێبازی ئیمان ناگرنە بەر.)))

---

(١) [الاعراف: ٣١ ].

(٢) أخرجه البخاري: ١٩٦٨.

(٣) [يونس: ١٠١].



**ج.** له ڕووی نەفسەوە: (قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا).[١] واته: ((بەڕاستی ئەو کەسە سەرفرازە کە نەفسی پاك و پوختە کردووە و ئیمان و ترسی خوای تیادا ڕواندووە.))

(وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا).[٢] واته: ((بێگومان نائومێد بوو ئەو کەسەی نەفسی خۆی ناپوخت کرد و ئاڵودەی گوناه و تاوان و خراپەی کرد.))

کەواتە ڕەوشتی ئیسلامی جەستە و ناخ و نەفس و ئەقڵی گرتەوە.

## ٢. ڕەوشتی ئیسلام بۆ خێزان

**أ.** پەیوەندی نێوان منداڵ و دایك و باوك: بۆ دایك و باوكان: (وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ إِحْسَانًا).[٣] واته: (ئێمە فەرمانمان بە ئادەمیزاد داوە کە چاکەکار و چاك ڕەفتار بێت لەگەڵ دایك و باوکیدا).

بۆ منداڵان: (وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَاقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْئًا كَبِيرًا).[٤] واته: ((نەکەن منداڵەکانتان لە ترسی گرانی و برسێتی بکوژن (چونکە پەروەردگارتان ڕۆزی بەخش و میهرەبانە)، ئێمە ڕزق و ڕۆزی دەبەخشین بەوانیش و بە ئێوەش، چونکە بەڕاستی کوشتنی ئەوان گوناه و تاوانێکی زۆر گەورەیە.))

---

(١) [الشمس: ٩].

(٢) [الشمس: ١٠].

(٣) [الاحقاف: ١٥].

(٤) [الاسراء: ٣ ].

**ب.** پەیوەندی هاوسەران: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهًا وَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلاَّ أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا).(١) واتە: ((ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دروست نییە بۆتان ژنان بە زۆر بکەنە میراتی خۆتان و دەستیان بەسەردا بگرن، (وەکو کەلوپەلی تری ناوماڵ)، ناچاریان مەکەن تا هەندێك مارەییتان بۆ بگەڕێننەوە، مەگەر ئەوان گوناهێکی ئاشکراو دیار ئەنجام بدەن، هاوژینییان بەجوانی لەگەڵدا بەرنەسەر، خۆ ئەگەر خۆشتان نەویستن و لێیان بێزار بوون، ئەوە دوور نییە و دەشێت حەزتان لە شتێك نەبێت و خوا بیکات بە مایەی خێروبێری زۆر و بێسنوور.))

**ج.** پەیوەندی نێوان خزمان: (وَآتِ ذَا الْقُرْبَىٰ حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَلاَ تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا).(٢) واتە: ((مافی خزم و خوێشان بەجێبهێنە و پەیوەندییەکان (لە چوارچێوەی شەرعدا چاودێری بکە) هەروەها مافی هەژارانیش (بە یارمەتیدانیان بەگوێرەی توانا) ئەنجام بدە هەروەها مافی ڕێبواریش (بە دەستگیرۆیی و ڕێنیشاندان) جێبەجێ بکە، دەستبڵاویش مەبە و ماڵ و سامانت بەفیڕۆ مەدە.))

---

(١) [النساء: ١٩].

(٢) [الاسراء: ٢٦].

### ٣. ڕەوشتی ئیسلام بۆ کۆمەڵگە

**أ.** ئادابی کۆمەڵایەتی: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَىٰ أَهْلِهَا ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ).[١]
واتە: ((ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە مەچنە هیچ ماڵێکی تر جگە لە ماڵەکانی خۆتان هەتا کارێك نەکەن کە ئەوان ئاگاداربن (وەکو زەنگ لێدان یان لە دەرگادان) پاشان کە مۆڵەتدران، سەلام بکەن لە خەڵکی ماڵەکە، ئەوە چاکترە بۆتان و بەو شێوەیە ڕەفتار بکەن، هەوڵ بدەن لە یادتان بێت و ئەو شێوازە فەرامۆش نەکەن (کاتی لەبار و گونجاو هەڵبژێرن بۆ سەردانەکانتان، بۆ ئەوەی میوان و خاوەن ماڵ دڵیان بەیەك بکرێتەوە.)))

**ب.** لە ڕووی ئابووری و مامەڵە و بازرگانییەوە: (وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ).[٢]
واتە: ((هاوار و ئاە و ناڵە بۆ تەرازووبازەکان، بۆ ئەوانەی کە لەکێشان و پێواندا لە کڕین و فرۆشتندا تەرازووبازی و فێڵ دەکەن (یان لە هەڵسەنگاندنی خەڵکیدا ڕاست ناڵێن.)))

(الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ)[٣]. واتە: ((ئەوانەی کاتێك شت لە خەڵکی دەکڕن بە تەواوی لێیان وەردەگرن.)).

---

(١) النور ( ٢٧ ).
(٢) [الْمُطَفِّفِينَ: ١].
(٣) [الْمُطَفِّفِينَ: ٢].



(وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ)[١]. واته: ((بەڵام كاتێك شتیان بۆ دەپێون یان دەکێشن لێی دەدزنەوە و کەمیان دەدەنێ و فێڵیان لێ دەکەن.))

**ج.** لە ڕووی سیاسی: (إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَىٰ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا).[٢] واته: ((بێگومان خوا فەرمانتان پێ دەدات کە هەموو ئەمانەتەکان (سپاردەکان) بگەڕێننەوە دەست خاوەنەکانیان و هەر کاتێکیش دادوەریتان کرد لەنێوان خەڵکیدا، دادپەروەرانە فەرمانڕەوایی بکەن، چونکە بەڕاستی خوا بەجوانی و چاکی و تەواوی ئامۆژگاری و فەرمانتان پێ دەدات، بەڕاستی خوا هەمیشەو بەردەوام بیسەر و بینایە.))

## ٤. ڕەوشتی ئیسلام لەبەرامبەر ئاژەڵ:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: (اتقوا في البهائم المعجمة، فاركبوها صالحة، وكلوها صالحة.).[٣] واته ((لەخوا بترسن لە بەرانبەر ئاژەڵە بێزمانەکان کە ناتوانن قسە بکەن، هەروەها جوان لێیان بخوڕن و سواریان بن، جوانیش بیانخۆن و سەریان بڕن.)) لە شوێنێکی تردا دەفەرمووێت: چەقۆکەیان بۆ تیژ بکەن و ئەگەر تینویان بوو پێش سەڕ بڕین ئاویان بدەن...

---

(١) [الْمُطَفِّفِينَ: ٣].

(٢) [النساء: ٥٨].

(٣) رواه أبو داود: ٢٥٤٨, والإمام أحمد في مسنده: ١٧٦٢٥.



### ٥. ڕەوشتی ئیسلام پەیوەست بە گەردوون:

(إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُولِي الألْبَابِ).[١] واته: ((بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویدا و لە ئاڵوگۆڕی شەو و ڕۆژدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانی ژیر و هۆشمەند.))

### ٦. ڕەوشتی ئیسلام پەیوەست بە خوای پەروەردگار:

(الْحَمْدُ للَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ).[٢] واته: ((سوپاس و ستایش هەر شایستەی خوایە و بۆ خوایە، کە خاوەن و پەروەردگاری هەموو جیهانیان و هەموو بوونەوەرە.))

(الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ). الفاتحة (٣). واته: ((بەخشندەی میهرەبان، کانگای ڕەحمەت و میهرەبانییە (ڕەحمەتی لە دنیادا هەموو شتێکی گرتۆتەوە، بەڵام لە قیامەتدا تەنها بۆ ئیماندارانە.)))

(مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ). الفاتحة (٤). واته: ((خاوەن و سەرداری ڕۆژی پاداشت و سزایە (پادشای ڕۆژی قیامەتە کە دادپەروەری ڕەها و بێسنووری تێدا بەرپا دەکات)))

(إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ). الفاتحة (٥). واته: ((خوایە، تەنها هەر تۆ دەپەرستین و هەر لە تۆش داوای یارمەتی و پشتیوانی دەکەین (لە کاروباری دین و دنیاماندا، بەکەسی تر لە بەندەکانت ناکرێت).))

---

(١) [آل عمران: ١٩٠].

(٢) الفاتحة (٢).

(اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ). الفاتحة (٦). واتە: ((خوایە بەردەوام ڕێنموویی‌مان بفەرموو بۆ ئەم ڕێبازە ڕاست و دروستە كە ئیسلامە.))

## گشتگیری ئیسلام لە ڕووی تەشریع و یاسا و ڕێكخستن

ئەم بەشە بریتییە لە پەیوەندی نێوان مرۆڤەكان خۆیان (المعاملات)، ئیسلام زۆر بەجوانی و ڕێكوپێكی بەرنامەی بۆ داناوە بەشێوەیەك كە هیچ شتێكی تێدا نییە كە لەگەڵ مرۆڤ و مرۆڤایەتی و عەقڵ و سروشت و فیترەت و ڕۆح و ناخی مرۆڤدا نەگونجێت، ئەم بەرنامە و گرنگی پێدانە هەم لە قورئان هەم لە سوننەت و هەم لە زانستی (فقە) بوونی هەیە، بۆنموونە ئەو یاسایانەی ئەمڕۆ باون و كاریان پێ دەكرێت لە جیهاندا، هەموویان زۆر جوانتر و باشتر و ڕێكوپێكتر و تێروتەسەلتر بوونیان هەیە لە ئیسلامدا، بۆنموونە: یاسای باری كەسێتی (قانون الاحوال الشخصیە). یاسای شارستانی (القانون المدني). یاسای دادبینی (قانون المرافعات). یاسای تایبەتی نێودەوڵەتی( القانون الدولي الخاص). یاسای گشتی نێودەڵەتی (القانون الدولي العام). یاسای دەستوری (القانون الدستوري). یاسای دارایی (القانون المالي). یاسای تاوانكاری ( القانون الجنائي)

## گشتگیری ئیسلام لە ڕووی پابەندبوونەوە

ئیسلام تەنها عەقیدە یان شەریعە یان ڕەوشت یان تەزكیە نییە، بەڵكوو هەموویانە، بۆیە پێویستە پابەندبین بە هەموویانەوە نەوەك یەك لا بگرین و ئەوانی تر پشتگوێ بخەین.

## گشتگیری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.)

سەرمەشقی و پێشەوایەتی محمد (دروودی خودای لەسەر بێت.) گشتگیرە بۆ کایەکانی ژیان

((لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا))[(١)]. واتە: ((بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا (دروودی خودای لەسەر بێت.) باشترین و چاکترین سەرمەشق و پێشەوایەتی هەیە بۆ ئێوە و نموونەی تەواو و جوان، بەتایبەت بۆ ئەوکەسانەی ڕەزامەندی خوایان لا مەبەستە، سەرفرازی قیامەت ئاواتیانە و زۆر یادی خوادەکەن و زمانیان پاراوە بە ناوی ئەو.))

ئەو ئایەتە قورئانییە پەیوەستە بە گەورەترین و بەرزترین مرۆڤ، کە پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێت.) ئاماژە بەوە دەکات کە ئێمە لە هەر بوارێك بمانەوێت سەرمەشق و پێشەوا و نموونەی تەواو و جوانمان هەیە، کە پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێت.)، بەتایبەتتر ئەوانەی ڕەزامەندی خوایان لا مەبەستە و دەیانەوێت خوا لە خۆیان ڕازی بکەن و دەیانەوێ لە قیامەتدا سەرفراز بن. کەواتە هەر کەسێك دەیەوێت خوا لە خۆی ڕازی بکات و سەرفرازی دونیاو قیامەت بێت، با پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) بکاتە سەرمەشق و پێشەوای خۆی

ئێمە لە هەر بوارێك بڕوانینە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) پەکمان ناکەوێت، چونکە پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێت.):

---

(١) [الاحزاب:٢١]

بێباوك بووه و سۆزی باوكی نەبینیوە كەواتە بۆ بێباوكان سەرمەشقە. زۆر زوو و هەر بە منداڵی دایكیشی وەفاتی كردووە و بێبەش بووە لە سۆزی دایكیشی، كەواتە بۆ بێدایكانیش سەرمەشقە. شوان بووە، كەواتە بۆ شوانانیش سەر مەشقە. كاری بازرگانیشی كردووە، كەواتە بۆ بازرگانان و كاسبكارانیش سەر مەشقە. خێزاندار و هاوسەر بووە، كەواتە بۆ خێزانداران و هاوسەرانیش سەرمەشقە. باوك بووە، كەواتە بۆ باوكانیش سەرمەشقە. باپیر بووە، كەواتە بۆ باپیرانیش سەرمەشقە. هەژاریی بینیوە، كەواتە بۆ هەژارانیش سەر مەشقە. دەوڵەمەندیی بینیوە، كەواتە بۆ دەوڵەمەندانیش سەرمەشقە. ستەملێكراوبووە، كەواتە بۆ ستەملێكراوانیش سەر مەشقە. ئازاردراو و ئەشكەنجەدراو بووە، كەواتە بۆ ئەوانیش سەرمەشقە. سوكایەتی پێكراو و گاڵتەپێكراو بووە، كەواتە بۆ ئەوانیش سەرمەشقە. بوختان بۆكراو بووە، كەواتە بۆ ئەوانیش سەرمەشقە. دەركراو و دەربەدەر بووە، كەواتە بۆ ئەوانیش سەرمەشقە. هیجرەتكار و هیجرەتی كردووە لە زێدی خۆی، كەواتە بۆ ئەوانیش سەرمەشقە. پێشەوا و قائیدی سوپا بووە، كەواتە بۆ ئەوانیش سەرمەشقە. سیاسی و بەڕێوەبەر و دەوڵەتدار بووە، كەواتە بۆ ئەوانیش سەرمەشقە. خواناس و زاهید و عابید بووە، كەواتە بۆ ئەوانیش سەرمەشقە. فیز و تەكەبوور بووە سەرەڕای ئەو هەموو دەستڕۆیشتوویی و دەسەڵات و گەورەییە، كەواتە بۆ ئەوانیش سەرمەشقە. ڕاستگۆ بووە، كەواتە بۆ ڕاستگۆیانیش سەرمەشقە. منداڵ لەدەستدراو بووە، كەواتە بۆ ئەوانیش سەرمەشقە.

هەروەها دڵسۆز و ئارامگر و تەوبەكار و متمانەبەخۆبوو و بەهیوا و ئومێد و گەشبین بووە، هەروەها پشتبەستو بەخوا و خەڵوەتكار

و ملکەچ بۆ حەق و ڕاستی بووە، ئەمانەتپارێز و قوربانیدەر و پاك و خاوێن و جوان و ڕێکوپێك و سەخی و بەبەزەیی و بەسۆز بووە، لێبووردە و دادگەر و حیکمەتدار و داوێنپاك و دەم پاك و دەست پاك بووە، نەرم و نیان و ئازاو چاونەترس و بەقەناعەت و گورج و گۆڵ و هیممەت بەرز بووە، ڕووخۆش و دەم بە خەندە و ڕق و کینەی خواردۆتەوە، بیرکەرەوە و بیر تیژ بووە، دەم بە زیکر و بەئینساف و جددی و بەڕێز بووە، ڕق لەدڵ و سنووربەزێن و بەکەم سەیرکەر و خۆبەگەورەزان و بەئیرەیی و فێڵکار نەبووە، ئەمانە و چەندین ڕەوشتی تری بەرز لەو تاقە کەسە بەڕێزەدا هەبوونە.

ئەوانە بە شاهێدی دوژمنەکانیشی بوونیان هەبووە لەو پێغەمبەرە مەزنەدا.

کەواتە هەرخۆی شایەنی پێشەوایەتی و پێشەنگبوون و سەرمەشق و ئیماماتییە.

## ئەرکی ئێمە بەرانبەر گشتگیری ئیسلام

**١.** باوەڕبوون پێی

**٢.** جێبەجێکردنی

**٣.** پەروەدەکردنی خەڵك لەسەری

**٤.** بانگەوازیکردن بۆی

## مرۆڤایەتیبوونی ئیسلام (الإنسانیة)

ئیسلام مرۆڤایەتییە، واتە لەگەڵ مرۆڤدا دەگونجێت و هیچ تێکگیرانێکی نییە لەگەڵیدا، هەم لە ڕووی عەقڵییەوە، هەم لە ڕووی ناخ و نەفس و ڕووح و ڕەوشت و تەشریع و یاساوە، واتە هەم لە ڕووی عەقیدەوە هەم لە ڕووی ڕەوشتەوە، هەم لە ڕووی عیبادەت و تەشریع و یاساوە.

### ١. لە ڕووی عەقیدەوە

**١.** لە ڕووی عەقیدەوە ئیسلام مرۆڤایەتییە، چونکە تەواو تەواو لەگەڵ عەقڵی دێتەوە و تێکگیران نییە لەگەڵیدا، بۆنموونە:

لە ڕووی باوەڕبوون بە خوداوە

لە ڕووی باوەڕبوون بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرەوە

لە ڕووی باوەڕبوون بە ڕۆژی دواییەوە

هەروەك لە باسەکانی پێشوودا بەدرێژی باسمانکردوون، هەر یەك لە مانە باوەڕبوون پێیان تەواو تەواو لەگەڵ مرۆڤ و عەقڵدا دێتەوە.

### ٢. لە ڕووی عیبادەت و پەرستشەوە

لە ڕووی عیبادەت و پەرستشیشەوە ئیسلام مرۆڤایەتییە، چونکە عیبادەتەکانی هەموو لەگەڵ کیانی مرۆڤدا دێتەوە و شتێکی تێدا نییە

تێکگیرانی هەبێت لەگەڵیدا، نەوەك هەر ئەمە، بە دەیان فەلسەفە و حیکمەت و سوودی تێدایە بۆ مرۆڤ هەروەك باسمانکرد لە باسەکانی پێشوودا، هەر عیبادەتێك دەیگری بە دەیان سوودی هەیە بۆ مرۆڤ، کەواتە لەم ڕووەشەوە ئیسلام مرۆڤایەتی بوو.

### ٣. لە ڕووی تەشریع و یاساوە

ئیسلام لە ڕووی تەشریع و یاساشەوە تەواو مرۆڤایەتییە و فەلسەفەی شەریعەکەی لەسەر دوو شت وەستاوە:

**یەك:** ڕاکێشانی سوود و قازانج بۆ مرۆڤ لە ڕێی شەرعی و بەبێ ئەوەی لەسەر حیسابی ئەوانی تر بێت.

**دوو:** دوورخستنەوەی زیان

کەواتە هەر شتێك بیگری لە شەریعەی ئیسلامیدا ئەم دوو بنەمایەی تێدایە و هەمووی بۆ مرۆڤ و لە خزمەتی مرۆڤدایە.

### ٤. لە ڕووی ڕەوشتییەوە

لە ڕووی ڕەوشتیشەوە ئیسلام مرۆڤایەتییە و هەموو بنەما ڕەوشتیەکانی بۆ بەرز ڕاگرتنی مرۆڤە و شتێکی تێدا نییە لەگەڵ مرۆڤدا نەیەتەوە.

هەر بنەمایەکی ڕەوشتی بیگری بۆ پاراستنی مرۆڤ و پاراستنی گەورەییەکەیەتی.



## ٥. لە ڕووی گەڕان بە دوای حەقیقەت و داهێناوەوە

ئیسلام لەم ڕووەشەوە مرۆڤایەتییە (ئینسانییە) و بەردەوام هانمان دەدات بۆ گەڕان بە دوای حەقیقەتدا، وەك وتراوە: (الحكمة ضالة المؤمن أنی وجدها فهو أحق بها). واتە ((حیكمەت و دانایی ونبووی موسڵمانە لە هەرشوێنێك بیدۆزێتەوە لە هەموو كەس ئەولاترە پێی.))

ئیسلام لە هەموو ڕووەكانەوە مرۆڤایەتییە و هەمووی بۆ خزمەتی مرۆڤە و لە بەرژەوەندی ئەودایە، باشترین بەڵگەش ئەوەیە كە هەر شتێك زیانی بۆی هەبێت حەرامە و هەرچیش خزمەتی بكات پێویستە و نابێت تەمبەڵی تێدا بكرێت.

## قورئان پەیامێكە بۆ مرۆڤ

قورئانیش بۆ مرۆڤە و مرۆڤ دەدوێنێت، ئەگەر لێی وردبینەوە مرۆڤ لە قورئاندا بووە بە سەنتەر، لە قورئاندا (إنسان) ٦٣ جار هاتووە، بە دەستەواژەی تری وەك (آدم) ٦ جار هاتووە، بە دەستەواژەی (الناس) یش ٢٤٠ جار هاتووە.

### محمد (دروودی خودای لەسەر بێت.) پێغەمبەری مرۆڤە

محمد (دروودی خودای لەسەر بێت.) بۆ مرۆڤەكان هاتووە و خۆیشی هەر مرۆڤ بووە، (قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰ إِلَيَّ)[١]. واتە: ((ئەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.)پێیان بڵێ: بەڕاستی من تەنها ئادەمیزادێكم وەك ئێوە، بەڵام ئەوەندە هەیە وەحی و نیگام بۆ دێت.))

### لایەنی مرۆڤایەتی لە پەیامی ئیسلامدا

هەر كایەیێك بگری لە كایەكانی ئیسلام خاڵی نییە لە لایەنی مرۆڤایەتی:

زەكات بۆ هەژارانە.

خێر و سەدەقە بۆ هەژارانە.

نوێژ بەشێكی بۆ دووركەوتنەوەیە لە خراپەكاری...

---

(١) [الكهف: ١١٠].

ڕۆژوو بەشێكی بۆ بەزەیی هاتنەوە و هەستكردنە بە نەدار...

حەج بەشێكی بۆ یەكترناسی مرۆڤە...

هەربۆیە هەر لایەنێك بگری مرۆڤ تێیدا سەنتەرە و بۆ خزمەتی مرۆڤە.

## مرۆڤایەتی مرۆڤ

مرۆڤایەتی بەگشتی دوو هەڵوێستی هەڵەی بەرانبەر مرۆڤ هەبووە:

**١.** مرۆڤ دەكات بە خودا.

**٢.** مرۆڤ دەكات بە ئاژەڵ.

بەڵام ئیسلام مروڤ نە دەكات بە خوا و نە بە ئاژەڵیش بەڵكوو مرۆڤ وەك مرۆڤ سەیر دەكات، نە پیرۆزی دەكات نە سووك و بێنرخیشی دەكات.

## ڕێزی مرۆڤ لە تێڕوانینی ئیسلامدا

**١.** مرۆڤ جێنیشینە لەسەر زەوی. (وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً).[1] واتە: ((ئەی محمد (دروودی خوای لەسەر بێت.)، باسی ئەوە بكە لە دێرین زەماندا) پەروەردگارت بە فریشتەكانی وت: بەڕاستی من دەمەوێت لە زەویدا جێنشینێك دابنێم (بۆ ئاوەدانی و دینداری).))

---

(١) [البقرە: ٣٠].

**٢.** مرۆڤ به‌ جوانترین شێوه‌ دروستكراوه‌. (لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ).[١] واته‌: ((به‌ڕاستی ئێمه‌ مرۆڤمان له‌ جوانترین شێوه‌ و ڕێكوپێكترین شێوازدا دروستكردووه‌ له‌ هه‌موو ڕوویه‌كه‌وه‌.))

**٣.** ئینسان ڕووحی پێدراوه‌. (إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِّن طِينٍ).[٢] واته‌: (كێشه‌ی فریشته‌كان كاتێك بوو كه‌ په‌روه‌ردگارت پێی وتن: من ده‌مه‌وێت به‌شه‌رێك، له‌ قوڕ دروست بكه‌م).

(فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ).[٣] واته‌: ((جا كاتێك دروستمكرد و له‌و گیان و ڕووحه‌ی كه‌ من خاوه‌نی ئه‌وم، فووم پێدا كرد و گیان و ژیانم پێ به‌خشی، ئێوه‌ی فریشته‌ هه‌مووتان سووژده‌ی (ڕێز و ته‌قدیری به‌ فه‌رمانی من) بۆ به‌رن.))

**٤.** هه‌موو گه‌ردوون بۆ مرۆڤ ڕام و موسه‌خخه‌ر كراوه‌. (أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً).[٤] واته‌: ((ئایا سه‌رنجتان نه‌داوه‌ كه‌ به‌ڕاستی هه‌رچی له‌ ئاسمانه‌كان و زه‌ویدا هه‌یه‌ هه‌ر هه‌مووی خوا بۆ خزمه‌تی ئێوه‌ی دروستكردووه‌ و ملكه‌چی كردووه‌، هه‌روه‌ها به‌فراوانی ناز و نیعمه‌تی ئاشكرا و په‌نهانی به‌سه‌ردا ڕژاندوون؟))

---

(١) [التين: ٤].

(٢) ص ( ٧١ ).

(٣) ص ( ٧٢ ).

(٤) [لقمان: ٢٠].



**٥.** نەهێشتنی هیچ بەربەست و ئاستەنگ و واستەیەك لە نێوان خودا و مرۆڤدا، (وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ).[1] واتە: ((ئەی محمد (درودی خودای لەسەر بێت. ) ئەگەر بەندەکانم پرسیارت لێ بکەن دەربارەم، ئەوە من نزیکم لێیانەوە، بە هاناو هاواری نزا و گوێیانەوە دەچم هەر کاتێك لێم بپاڕێنەوەو نزا بکەن، دەبا ئەوانیش بەدەم بانگەوازی منەوە بێن و باوەڕی دامەزراو بە من بهێنن، بۆ ئەوەی ڕێگای هۆشیاری و ئاگایی بگرنەبەر (بۆ بەدەستهێنانی سەربەرزی و سەرفرازی هەردوو جیهان)))

**٦.** ڕێزگرتن لە هەموو کیانی مرۆڤ. ئیسلام ڕێزی لە هەموو کیانی مرۆڤ گرتووە، لە عەقڵی و لە ڕووح و ناخ و نەفسی و لە جەستە و لاشەی، هەر بۆیە شتێك نابینیت لەگەڵ ئەمانەدا تێکبگیرێت.

**٧.** ئازادکردنی مرۆڤ لە کۆیلایەتی. ئیسلام مرۆڤی ئازاد کرد، لە بەندایەتی بەندەکانەوە هەمووانی بە یەکسانی کردەوە بە بەندەی خاوەنەکەی خۆیان و هەمووشیانی لە خۆپەرستی داماڵی، یەکتاپەرستی بۆیە گرنگە چونکە ئەو کات هیچ شتێك ناپەرستی جگە لە خودا و ئازا و ئازاد دەبی لە پەرستنی خۆت و خەڵك و ماددە، بەمەش یەك ئاڕاستە دەگری بەرەو یەك ئامانج.

**٨.** چەسپاندنی مافەکانی مرۆڤ. ئیسلام هەموو مافەکانی مرۆڤی چەسپاند و هەمووانی بە مافەکانی خۆی شادکردەوە، ژن، پیاو، منداڵ، باوك، دایك، گەل و نەتەوە،...

---

(١) [البقرە: ١٨٦].

مافه‌كانی مرۆڤ وه‌ك له‌ باسه‌كانی دواتریشدا باسیان ده‌كه‌ین زۆر به‌ڕوونی ڕوونكراونه‌ته‌وه‌:

مافی ژیان

مافی ڕێز و كه‌رامه‌ت

مافی بیروڕا و عه‌قیده‌

مافی دینداری

مافی سیاسی

مافی ئابووری

مافی كۆمه‌ڵایه‌تی

مافی خوێندن و زانست

مافی یه‌كسانی

یه‌كسانی به‌رانبه‌ر خه‌ڵك و خودا و یاسا

**هه‌روه‌ها ئیسلام چه‌ند شتێكی تریشی بۆ مرۆڤ كردووه‌:**

**١.** برایه‌تی جیهانی و ئینسانی. له‌ تێڕوانینی ئیسلامدا هه‌موو مرۆڤه‌كان برا و خوشكن و هه‌موویان یه‌ك دایك و باوكیان هه‌یه‌ و هه‌موویان ده‌گه‌ڕێنه‌وه‌ سه‌ر یه‌ك بنه‌چه‌، (يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا).[١] واته‌: ((ئه‌ی خه‌ڵكینه‌ له‌ خه‌شم و ناڕه‌زایی ئه‌و په‌روه‌ردگاره‌تان خۆتان بپارێزن كه‌

---

(١) [النساء: ١].

ئێوەی لە تاکە نەفسێك دروستکردووە، هەر لەو نەفسەش هاوسەرەکەی بەدیهێنا و لەو دووانە پیاوان و ژنانی زۆری خستۆتەوە و بڵاوکردەوە، هەروەها لەو خوایە بترسن کە لە یەکتر داوا دەکەن بەناوهێنانی ئەوەوە، هەوڵ بدەن پەیوەندی خزمایەتیش بپارێزن و (پتەوی بکەن)چونکە بەڕاستی خوا (هەمیشە و بەردەوام) چاودێرە بەسەرتانەوە.))

ئەگەر سەیر بکەین دەفەموێت: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ) ئەی خەڵکینە.

**٢.** یەکسانی مرۆڤ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ).(١) واتە: ((ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە هەمووتانمان لە نێر و مێیەك دروستکردووە (کە باوکە ئادەم و دایکە حەوایە) و کردوومانن بە چەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆربەجۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بەیەکەوە. بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەتانن کە زۆرتر لەخواترسە و فەرمانبەرداری خوایە، بێگومان خوا زانا و ئاگایە بە هەمووان.))

بۆیە ئەگەر بڕوانییە هەموو دروشمە ئیسلامییەکان، دەبینی پڕپڕە لە یەکسانی!

بڕوانە نوێژ و ڕاوەستانی هەموان بەیەکسانی...

بڕوانە ڕۆژوو و پەیوەستکردنی هەموان بەیەکسانی.

بڕوانە حەج...

---

(١) [الحجرات: ١٣].



## ئیسلام له نێوان گەشەسەندن و جێگیریدا

## (بين التطور والثبات)



ئیسلام تاکە پەیامە توانیبێتی هاوسەنگی ڕابگرێت لە نێوان گەشەسەندن و جێگیریدا، واتە لەڕوویێکەوە گەشەدەسێنێت، لە ڕوێکیشەوە جێگیرە و نەگۆڕە، واتە هەم گۆڕاوە هەم نەگۆڕ، لەگەڵ گۆڕاوەکانی سەردەم و نەگۆڕەکانی خۆیدا دێتەوە!

دەتوانین بە دوو دێڕ ئەم بابەتە ڕوون بکەینەوە:

١. جێگیربوون لەسەر ئامانج و مەبەستەکان، نەرمی و مرونەت و گۆڕاوی لەسەر ئامڕاز و میکانیزم و هۆکارەکاندا.

٢. جێگیربوون لەسەر بنەما و ئوسوڵ و کولیات و شتە گشتیەکان، مرونەت و گۆڕاوی و نەرمینواندن لەسەر جوزئیات و فروع و لقەکاندا.

### جێگیری و گەشەسەندن لە ژیان و گەردووندا

ئەگەر بڕوانینە ژیانی مرۆڤ، هەم گۆڕاوی تێدایە هەم نەگۆڕ. بڕوانە زانیاری، بیرکردنەوە، شێوە، شکڵ، خۆراك، خواردنەوە، مادده، کەلوپەل و...، هەموویان دەگۆڕێن و لە گۆڕندان، بەڵام سەیری جەوهەری مرۆڤەکە بکە نەگۆڕە و ناگۆڕێت. کەواتە ژیانی مرۆڤ گوڕاو و نەگۆڕی تێدایە.



بڕوانە گەردوون دووبارە نەگۆڕ و گۆڕاوی تێدایە، سەیری شاخ و خۆر و مانگ و زەوی و...، بکە ناگۆڕێن، بەڵام سەیری کەش و هەواو ڕووبار و...، بکە بەردەوام دەگۆڕێن و نامێنن.

کەواتە ئیسلامیش کە بۆ مرۆڤ هاتووە و مرۆڤیش لەم ژیان و گەردوونەدا دەژییێت حەتمەن ئەویش گۆڕاو و نەگۆڕی هەیە.

ئەگەر سەیری قورئان و سوننەش بکەین وەك دوو سەرچاوەی سەرەکی ئیسلام، دەبینین ئەوانیش موحکەم و موتەشابیە و مەجاز و حەقیقەت و کینایە و ئیستیعارە و...، تێدایە، هەیە قبووڵی تەئویل دەکات هەشە قبووڵی ناکات.

کەواتە جیاوازی و هۆکاری گۆڕان:

**١.** دەگەڕێتەوە بۆ خودی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) چونکە ئەو خۆی ڕێیداوە و بواری بۆ هێشتۆتەوە.

**٢.** هاوەڵان و سەلەف لە تەفسیری قورئان ڕاجیایی زۆریان هەبووە.

**٣.** هاوەڵان لە شێوازی خوێندنەوەی قورئان ڕاجیاییان هەبووە.

**٤.** هاوەڵان و سەلەف لە بەشێك لە بابەتە عەقیدەییەکان ڕاجیاییان هەبووە.

**٥.** هاوەڵان و سەلەف لە بابەتە فیقهییەکان ڕاجیاییان هەبووە.

**٦.** هاوەڵان و سەلەف لە هۆکاری دابەزینی سوورەت و ئایەتەکان ڕاجیاییان هەبووە.

**٧.** هاوەڵان و سەلەف ڕاجیاییان هەبووە لە ئیجتیهاد و ئاڕاستەكانی، هەیانبوو زۆر لە دەقەوە نزیك بووە هەیانبوو زۆر مەقاسیدی بووە.

كەواتە مادام وابێت، گۆڕاوەكان لەلایەن خودی خوا و پێغەمبەرەوە ڕێیدراوە.

بەگشتی ئایین سێ بەشە

**١.** عەقیدە

**٢.** شەریعە

**٣.** ڕەوشت

**١. عەقیدە:** عەقیدە ئوسوڵی هەیە كە ناكرێت جیاوازی تێدابێت و ناگۆڕێت، هەروەها فروعیشی هەیە و پڕە لە جیاوازی، ئوسوڵ وەك بوونی خودا و بوونی دواڕۆژ، لەمانەدا گۆڕان و خیلاف نییە، فروع وەك وردەكاری بەرزەخ و ژیانی ناو قەبر و دیمەنەكان و وێستەگەكانی قیامەت، كە دیارە ئەمانە پڕیانە لە جیاوازی و ڕاجیایی.

**٢. ڕەوشت:** ڕەوشت نەگۆڕە و نیسبی و ڕێژەیی نییە، واتە بەپێی كەس و شوێن و كات ناگۆڕێت، بەڵام ئەویش هەندێك شتی هەیە لە هەندێك شتی تر گەورەتر و بەرزترە.

**٣. فیقهـ و شەریعەت:** ئەمەش دوو شت دەگرێتەوە:

**یەكەم:** پەیوەندی مرۆڤ بەخواوە

**دووەم:** پەیوەندی مرۆڤ بە مرۆڤەوە

**یەکەمیان:** کە پەیوەندی مرۆڤە بە خواوە خۆی لە پەرستشەکان (العبادات)دا دەبینێتە وەك نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەکات...، ئیسلام گرنگیەکی زۆری پێداوە و بەرنامە و سیستمێکی تایبەتی بۆ داناوە، هەم لە ڕێی قورئان و هەم لە ڕێی سوننەت و پاشان هەم لە ڕێی زانایان و دانانی زانستێك بەناوی (فیقهـ) (علم الفقه الإسلامي).

**دووەمیان:** کە بریتییە لە پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان خۆیان (المعاملات)، ئیسلام زۆر بە جوانی و ڕێکوپێکی بەرنامەی بۆ داناوە بەشێوەیەك کە هیچ شتێکی تێدا نییە لەگەڵ مرۆڤ و مرۆڤایەتی و عەقڵ و سروشت و فیترەت و ڕۆح و ناخی مرۆڤدا نەگونجێت. ئەم بەرنامە و گرنگی پێدانە هەم لە قورئان هەم لە سوننەت و هەم لە زانستی (فقه) بوونی هەیە.

ئەم بەشی سێیەمەش ئوسوڵ و فروعی هەیە کە فروعەکانی بە پێی سەردەم و کات و شوێن دەگۆڕێت، فیقهـ و عەمەل زۆرترین بواری گۆڕان و نوێکاری و ئیجتهادی تێدایە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا نەگۆڕ و گۆڕاوی هەیە، بۆنموونە  نوێژ و ڕۆژ و حەج و زەکات واجبن، بەڵام لە چۆنییەتی جێبەجێکردنەکەیدا خیلاف هەیە و بواری گۆڕان و ئیجتهادی تێدایە.

یان دزیکردن، زیناکردن،کوشتن، ڕیبا و...، حەرامن, بەڵام چۆنییەتی جێبەجێکردنی سزاکان خیلافی تێدایە و بواری گۆڕانی تێدایە.

گۆڕانی جەوهەری لەم بەشەی ئاییندا دەکرێت و قابیلی گۆڕانی هەیە.



ئەوەی لەکۆتاییدا پێویستە ئاماژەی پێبکەین ئەمەیە:

**١.** گۆڕاوەکان نەکەینە نەگۆڕاو و بواری ئیجتیهاد دانەخەین.

**٢.** نەگۆڕەکان نەگۆڕین و بیانپارێزین و بە ناوی کراونەوە و نوێکاری نەیانخەینە بەر لێشاوی تێکدان و لادان و ئینحراف.

تێبینی: بابەتی گۆڕان و نەگۆڕ، گۆڕاوەکان و نەگۆڕەکان بابەتێکی هەستیار و وردە و جێی مشتوومڕ و جیاوازی زانایانە بەڵام ئەوەی گرینگە ئەوەیە ئێمە باوەڕمان بە هەرووکیان هەبێت، نەوەك وەك ئەوانەی لایانداوە و هەموو شتێك لایان نەگۆڕە! بە پێچەوانەشەوە هەندێکی تر هەموو شتێکیان لا گۆڕاوە و نەگۆڕێکیان لا نەماوە و هەمووی بووە بە ڕێژەیی و نسبی!



## خودایی بوونی ئیسلام (الربانیة)



یەكێك لە تایبەتمەندییەكانی دیكەی ئیسلام خودایی بوونە (الربانیة).

### أ- ڕەببانییە لە ڕووی سەرچاوە و ڕێبازەوە

چونكە سەرچاوەكەی وەحی خودای گەورەیە بۆ كۆتا پەیامبەر محمد (دروودی خودای لەسەر بێت.) كە خۆی لە وتە و كەلامی خودای گەورەدا دەبینێتەوە، ناتەواوی تێدا نییە لە هیچ لایەكەوە، هەروەها خۆی لەسوننەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێت.) دەبینێتەوە كە ڕوونكەرەوەی قورئانە.

كەواتە ئایینێكی ڕەبانی تەواوی بێ كەموكوڕییە، هیچ كەم و زیادەیێك قبووڵ ناكات، هەروەها بەشێوەیەك چەسپاو و تۆكمەیە كە قبووڵی دەستكاریكردن و گۆڕانكاریكردن ناكات، واتا هیچ فەرمانڕەوا و كۆمەڵەیەكی زانستی و كۆنگرەیەكی دینی بۆی نییە زیاد و كەمی تێدا بكات.

## ب- هەواڵدانە لەبارەی ڕاستیەكانی بوون و پەروەردگاری بوون

ئیسلام بریتی نییە لەو (ئینشا)[١]یەی كە لەزانستی لۆژیك و ڕەوانبێژی و بەلاغەدا هەیە، بەڵكوو بریتیە لە هەواڵدان، چونكە بریتییە لەكۆمەڵە هەواڵێك لەبارەی بابەتە مەزنەكان لە بوون: دەربارەی خودای گەورە و ناو وسیفەتەكانی، هەروەها دەربارەی جیهانە نادیارەكان كە بە هەستەكانمان درك ناكرێن و عەقڵمان وردەكاری لەبارەوە نازانێت.

جا كەسیش ناتوانێت هەواڵ لەبارەی ئەو بابەتانە بدات جگە لە كەسێك كە بەتەواوی درك و هەستیان پێدەكات و عیلم و زانستی تەواوی پێیان هەیە، ئەویش خودای گەورەیە. بەڵام مرۆڤەكان تایبەتمەندیان لە بواری ئەو شتە نادیارانەوە نییە.

## ج- سەلامەت و پارێزراوە لە گۆڕان و دەستكاریكردن

ئیسلام تاكە بەرنامە و بیروباوەڕە لە جیهاندا كە سەرچاوەكەی وتەی پەروەردگارە، نە گۆڕاوە و نە دەستكاریكراوە و نە لەگەڵ خەیاڵ و هەڵە و پەڵەی بەندەكان تێكەڵ بووە.

ئەو بیروباوەڕانەی ئەمڕۆ دەستیان بەسەر جیهانداگرتووە جگە لە ئیسلام سێ بیروباوەڕن:

١- بیروباوەڕێكی گۆڕدراو: ئەگەر لە بنەڕەتیشدا لە لای خودای گەورەوە هاتبێت، لەدواییدا دەستی گۆڕین و زیادكرن و كەمكردنی

---

(١) ئینشا بریتییە لەئسلوبی داواكاری (داخوازی) وەكوو: داخودازیكردنی كارێك یان نەكردنی یان پرسیار كردن یان بانگكردن، واتا ڕستەی هەواڵدان نەبێت.

پێ گەیشتووە. جا هەندێك شتیان بۆ زیادكردووە كە تێیدا نەبووە، هەندێك شتیشیان لێ كەمكردووەتەوە كە تێیدابووە، یان قسەی خودای گەورەیان لەگەڵ قسەی خەڵكی تێدا تێكەڵ كردووە، بۆیە هیچ متمانەیەك نەماوە لەوەی سەرچاوەی ئەو بیروباوەڕە لەلای خودای گەورەوە بێت، ئەوەش وەكوو ئایینی جوولەكە و مەسیحی.

**٢-** بیروباوەڕێكی ئایینی مرۆیی: وەكوو ئایینی بوزی لە چین و یابان و هیند، كە هیچ بنەڕەتێكی ئاسمانی نییە، سەرچاوەكەشی ئەندێشەی مرۆڤە.

**٣-** ڕێبازێكی مرۆیی تەواو: سەرچاوەكەی ئەندێشەی ئەقڵ و فەلسەفەی مرۆڤێك یان كۆمەڵە مرۆڤێكە، وەكوو ڕێبازی شیوعی كە لەماوەیەكی كەمدا پوكایەوە، یان ڕێبازی سەرمایەداری و وجودی و .... .

بەڵام بیروباوەڕی ئیسلامی ئەو بیروباوەڕەیە كە سەلامەتە لە هەموو دەستكاری كردن و دەستوەردانێكی مرۆڤ، چونكە خودای گەورە خۆی پاراستنەكەی گرتۆتە خۆ، وەك دەفەرموویت: ﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ٩ ﴾.[١] واتا: ((بەڕاستی ئێمە قورئانمان دابەزاندووە و هەر بۆخۆشمان دەیپارێزین.))

## د- ئامانج و مەبەستی خودایە:

هەروەكوو چۆن سەرچاوە و ڕێبازی ئیسلام لەلایەن خوداوەیە، بە هەمان شێوە ئامانج و مەبەستیشی خودای گەورەیە، چونكە ڕۆژی دوایی دەكاتە ئامانجی مرۆڤ، هەروەها ئامانجە دوورەكەی بریتییە

---

(١) الحجر: ٩.

له‌ په‌یوه‌ندی باش و پته‌و له‌گه‌ڵ خودای گه‌وره‌دا و به‌ده‌ستهێنانی ڕه‌زامه‌ندییه‌كه‌ی، بۆ ئه‌وه‌ی ببێته‌ به‌نده‌یه‌كی نیه‌تپاك له‌گه‌ڵ خودای گه‌وره‌دا. ئه‌وه‌ش بریتییه‌ له‌ واتای ته‌وحید و یه‌كتاپه‌رستی: به‌ته‌نها خوداپه‌رستن، هه‌روه‌ها كه‌س نه‌كرێت به‌هاوبه‌شی.


## فیتری بوونی ئیسلام (الفطرية)


ئیسلام هەماهەنگە لەگەڵ سروشت و فیترەتی پاك، بەڵام ئایینەکانی تر بەزارەکی لە باب و باپیرانەوە وەرگیراوە و لەژێر کاریگەری ژینگەدایە، ئەوەش چەند نموونەیەك لەسەر هەماهەنگی بیروباوەڕی ئیسلامی لەگەڵ فیترەت و سروشتی پاکدا:

نموونەی یەکەم: بوونی خودای گەورە و تاك و تەنها: مرۆڤ بە سروشتی پاکی خۆی دەزانێت کە ئەو گەردوونە خودایەکی هەیە، جا ئەگەر ئەو سروشتە بەدی نەکرێت و دەرنەکەوێت لەکاتی گاڵتە و خۆشیدا، ئەوە لە کاتی ناخۆش و تەنگوچەڵەمەدا دەردەکەوێت.

ئەگەر بێتو مرۆڤ بە سروشت و دەروونی خۆی بڕیار بدات بێ ئەوەی بکەوێتە ژێر هیچ کاریگەریەکی دەرەکی، ئەوە دان بە بوون و تەنهایی خودای گەورەدا دەنێت.

نموونەی دووەم: باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی: باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی سروشتێکە کە خودای گەورە داویەتی بە مرۆڤ و لەسەر ئەو سروشتەش دروستیکردووە، ئەوەتا هەموو مرۆڤێك لە ناخی خۆیدا هەست بەوە دەکات کە تەنها بۆ ئەو ژیانە و ئەو ماوە کورتە دروست نەکراوە.



## ڕوونی و ڕەوانی ئیسلام (الوضوح)

ئیسلام ڕوونه و هیچ ئاڵۆزی و ناڕوونییەكی تێدا نییه. لەگەڵ هەموو مرۆڤەكاندا دەگونجێت، هەموو ئاسته ئەندێشەیی و كۆمەڵایەتیەكان قەناعەت پێ دەكات، ئەوەش چەند نموونەیەك لەسەر ڕوونی ئەو بیروباوەڕە:

### نموونەی یەكەم: لەبارەی خودای گەورە:

پوختەی ئەو بیروباوەڕە لەبارەی خودای گەورە ئەوەیە كە باوەڕت بە بوونی خودای گەورە هەبێت، هەروەها ئەو گەردوونە داهێنەرێك و ڕێكخەرێكی هەیە كە دروستی كردووە و ڕێكی خستووە و هەموو شتێكی تێدا داناوە.

بەراوردێك:

**أ-** ئەو ڕوونی و ئاشكراییيه لەكوێ و بیروباوەڕی بەسێ كردن (التثلیث)[1] لەلای وەسەنییه كۆنەكان، یان بیروباوەڕی دیانەكان لەكوێ كە بەو وەسەنیەتە كاریگەر بوون و یەك خودا دەكات بە سێ خودا و سێ خوداش بەیەك خودا، دەڵێن: باوك و كوڕ و ڕووحی پاك

---

(١) واتا: بیروباوەڕی ئەوانەی دان بە بوونی سێ خودا دەنێن (باوك وكوڕ و ڕووحی پیرۆز) (الله، عیسی، مریم).

یەك خودان! ئەوەش پێچەوانەی ئەقڵە و ئەقڵ سەرگەردان دەكات و داوای بیروباوەڕێكی مەحاڵ لەخۆی دەكات؟!

**ب-** ڕوونی و ئاشكرایی بیروباوەڕی ئیسلامی لەكوێ و بیروباوەڕی جوولەكەكان لەكوێ كە دەڵێن: عوزێر كوڕی خودایە، یان ئەوانەی جەستە بۆ خودای گەورە بڕیاردەدەن و بەشێوەیەك قسە لەبارەی خودای گەورە دەكەن وەكوو ئەوەی مرۆڤێك بێت؟!

**ج-** ڕوونی و ئاشكرایی بیروباوەڕی ئیسلامی لەكوێ و بیروباوەڕی وەسەنییەكان(١) لەكوێ كە خۆر و بەرد و مرۆڤ و مانگا دەكەن بە خودا ؟!

### نموونەی دووەم: لەبارەی خودی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.)

ئیسلام لەبارەی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێت.) ڕون و ئاشكرایە هیچ ناڕوونی و تێكەڵی و بانگەشە و ئەفسانەیەكی تێدا نییە. بریتییە لە مرۆڤێك خودای گەورە هەڵیبژاردووە و تایبەتی كردووە بە وەحی و نیگای خۆی.

فریشتەش نییە و شتە بەپەنهانەكانیش نازانێت ئەوەندە نەبێت كە خودای گەورە پێی گوتووە و پێی ڕاگەیاندووە، هیچ دەستێكیشی نییە لە بەڕێوەبردنی گەردوون، تەنها گەیەنەری پەیامەكانی پەروەردگاریەتی.

---

(١) ئەوانەی پەیكەری ئاژەڵ و مرۆڤ دەپەرستن



بەراوردێك:

**أ-** ئەو ڕاشکاویی و ڕوونییە لەکوێ و قسەی دیانەکان لەکوێ لەبارەی کەسایەتی پێغەمبەر عیسا و ئەو سیفەتانەی دەیدەنە پاڵ و دەڵێن: ئەو خودایە و کوڕی خودایە و یەکێکە لە سێ خودایەکە ؟!

دیانەکان کەسایەتی مەسیحیان لەلا ڕوون نییە، تا ئەو ڕادەیەی چەندین ناوەندی توێژینەوەیان پێکهێناوە بۆ ئەوەی لە سروشتی بکۆڵنەوە کە ئایا خودایە؟! یان کوڕی خودایە؟! یان مرۆڤێکی تەواوە؟! یان مرۆڤە و خودایەتی تێیدا تواوەتەوە؟! یان بەشێکە لە سێ بەش و کەسە سەرەکیەکەیە کە خودای لێ پێکدێت: باوك و کوڕ و ڕووحی پاك؟! هەروەها لە خودی ڕووحی پاکدا ناکۆکن کە بریتییە لە چی؟ پەیوەندی بە دوو بەش و کەسە سەرەکیەکەی ترەوە چییە؟ یان دایکی مەسیح کێیە؟ بەشی ئەو چییە لە خودایەتی و مرۆڤیەتی؟

**ب-** ئەو ڕوونییەی ئیسلام لەکوێ و قسەی جوولەکەکان لەکوێ کە لەبارەی یەعقوب (علیه السلام) چەندین ئەفسانەیان هەیە دەڵێن: زۆرانبازی لەگەڵ خودا گرتووە (پەنا بەخودا)، ئینجا سەریشکەوتووە بەسەریدا!

**ج-** یان ئەو هەموو جیاوازیەی هەیە لەنێوان ئەو ڕاشکاوی و ڕوونییەی ئیسلام و ئەو چیرۆکە ئەفسانەیی و خوڕافیانەی کە لەو تەوڕاتەی ئێستادا هەیە.



## نموونەی سێیەم: لەبارەی بەرپرسیاریەتی و پاداشت و سزا:

ئیسلام بەڕوونی بڕیار لەسەر بەرپرسیاریەتی مرۆڤ دەدات لەبەرانبەر کردەوەکانی، بۆیە نە هیچ کوڕێك دەکەوێتە ژێرباری تاوانەکانی باوکی و نە هیچ برایەك باری تاوانی براکەی هەڵدەگرێت، هەموو کەس بارمتەی کردەوەکانیەتی و وابەستەی گوناهەکانیەتی.

بەراوردێك: ئەو دادپەروەریە لەکوێ و بیروباوەڕی دیانەکان لەکوێ کە دەڵێن: تاوانی باوکمان ئادەم (کە خواردنی دارەکە بوو لە بەهەشت) لەسەر شانی نەوەکانی بوو لە دوای خۆی تا ئەوکاتەی مەسیح هات و خۆی خستە بەردەم لەخاچدان (صلب) وەکوو قوربانییێك بۆ سڕینەوە و لادانی تاوانی ئادەم لەسەر شانی نەوەکانی، بۆ ئەوەی پاکیان بکاتەوە لەو تاوانە و دەربازیان بکات.



## بەڵگەداری ئیسلام (البرهانیة)



یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندیەکانی ئیسلام ئەوەیە کە هەماهەنگە لەگەڵ عەقڵ و پشت ئەستوورە بە بەڵگە، هەر بە عەقڵ دروستی حوکمەکانی دەردەکەوێت، نەك سەپێنەر بێت لە حوکم و بابەتەکانیدا.

ئەوەش چەند بەڵگەیەکی عەقڵی کە قورئان دەیانخاتەڕوو سەبارەت بە بابەتە گەورەکانی عەقیدە و بیروباوەڕ:

### أ- بوونی خودای پەروەردگار:

ئەو بەڵگەیەیەی کە قورئان دەیخاتەڕوو لەسەر بوونی خودای گەورە ئەو دەقەی قورئانە کە دەفەرموویت:﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾﴾.[١]. واتا: ((ئایا مرۆڤ لەخۆیەوە دروست بووە یان خۆیان خۆیانیان دروستکردووە، یان ئەوان ئاسمان و زەویان دروستکردووە.))

جا مەحاڵە لە خۆوە دروستبووبن، چونکە ئەوە پێچەوانەی یاسای هۆکارە (السببیه) کە بریتییە لەوەی هەموو شتێك هۆکاری خۆی هەیە و هەموو دروستکراوێك دروستکاری هەیە کە ئەوە بیروباوەڕێکی سروشتی و عەقڵییە و کەس ئینکاری لێ ناکات. جا کە لە خۆوە

---

(١) الطور: ٣٥ – ٣٦.

دروست نەبووبن، ئەوە هەر ناكرێت خۆیان خۆیانیان دروستكردبێت، چونكە دروستكراو خۆی دروست ناكات، چونكە شتی دروستكراو بەرلەوەی دروست بكرێت هیچ شتێك نییە شتێكیش كە بۆخۆی نەبێت بوونی پێ بەدی نایەت.

هەروەها مەحاڵە ئەوان ئاسمان و زەویان دروستكردبێت چونكە بەرلەوەی ئەوان بێنەبوون و دروستببن ئەو ئاسمان و زەمینە هەر هەبووە، بۆیە هیچ كەسێك ناتوانێت بانگەشەی ئەوە بكات و بڵێت كە ئەو دروستی كردوون[١].

## ب- تاكیەتی خودای پەروەردگار:

ئەو بەڵگەیەی كە قورئان هێناویەتیەوە لەسەر تاكیەتی خودای پەروەردگار بریتییە لەو دەقەی كە دەفەرموویت:﴿ لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَاۚ فَسُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾[٢]. واتا: ((ئەگەر جگە لە خودای تاك و تەنها خودای تر هەبووایە، ئەوا گەردوون تێك دەچوو و ململانێ ڕوویدەدا.))

﴿ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَـٰهٍۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَـٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍۚ سُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾ ﴾[٣]. واتا: ((خودای گەورە هیچ منداڵی نییە و هەرگیز هیچ خودایەكی

---

(١) بۆ زانیاری زیاتر لەسەر بابەتی بوونی خودا بگەڕێوە بۆ پەرتووكمان: (بوونی باڵا: ٣٠ بەڵگەی زانستی و لۆژیكی و فكری و فیتری لەسەر بوونی خودا).

(٢) الأنبياء: ٢٢.

(٣) المؤمنون: ٩١.

تری لەگەڵ نەبووە. ئەگەر وا بووایە، ئەوكاتە هەرخودایەك دەچووە لای دروستكراوەكانی خۆیی و گرنگی پێ دەدا، هەروەها هەندێكیان خۆیان بە گەورەتر دەبینی لە هەندێكی تریان، پاك و بێگەردی و گەورەیی بۆ خودای تاك و تەنها لەو وەسفەی كە دەیكەن.

## ج- دابەزاندنی پەرتووكی ئاسمانی و ناردنی پەیامبەران:

هەروەها ئەو بەڵگە عەقڵییەی كە قورئان دەیخاتەڕوو لەسەر ناردنی پەیامبەران و دابەزاندنی پەرتووكەكان، ئەو دەقەیە كە دەفەرمووێت: ﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِذْ قَالُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَيْءٍ قُلْ مَنْ أَنزَلَ ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِي جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ تَجْعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓاْ أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْ قُلِ ٱللَّهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩١﴾ ﴾

خودای گەورە ڕوونی دەكاتەوە كە مرۆڤەكان كاتێك دەڵێن: خودای گەورە پەیامبەر و پەرتووكی نەناردووە بۆ بەندەكانی بەو قسەیان ناحەقیان كردووە و حەقی پەروەردگاریان نەداوە، ڕێز و قەدری تەواویان نەداوە بە خودای گەورە، چونكە بەڕەهایی ڕەتی دەكەنەوە كە خودای گەورە هیچ پەیامبەر و پەرتووكێكی ناردبێت, لە كاتێكدا خودای كاربەجێ بەندەكانی فەرامۆش ناكات، ئاوا بەبێ ئامانجی دەستبەرداریان نابێت، بێ ئەوەی بەرنامەیەكیان بۆ بنێرێت و پێغەمبەرێكیان بۆ بنێرێت كە نێوەندگیریان بكات لەو بابەتانەی كە ناكۆكن تێیدا.

د- زیندووکردنەوە و وەرگرتنەوەی پاداشت و سزا (بەپێی کردەوەکان)

قورئان چەند بەڵگەیەکی هێناوە لەبارەی دروستی زیندووکرنەوە و وەرگرتنی جەزای دادپەروەرانە بەپێی کردەوەکان، لەوانە:

**١-** دروستکردنی بوونەوەر لە نەبوونەوە: خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهۡوَنُ عَلَيۡهِۚ﴾ الروم: ٢٧. واتا: ((خودای گەورە ئەو زاتەیەکە بوونەوەر لە نەبوونەوە دروست دەکات، پاشان دووبارە دوای مردنیان زیندوویان دەکاتەوە کە دیارە ئەوە بەلایەوە ئاسانتریشە.))

ئەوە پێوانەیەکی سەرەتایی عەقڵیە کە قورئان دەیهێنێتەوە بۆ دروستی زیندووبوونەوەی جەستەکان و وەڵامدانەوەی ئەوانەی ئینکاری لەو بابەتە دەکەن و دەڵێن شتێکی مەحاڵە.

باشە دروستکردن لە نەبووەوە قورسترە یان دروستکرنەوەی دوای دروستکردن؟!

باشە کەسێك بتوانێت لە نەبووەوە بێنێتە بوون، چۆن ناتوانێ جارێکی تر بیهێنێتەوە بوون؟

ئەگەر وابێت، نابێت بێباوەڕەکان باوەڕیان بە خۆشیان هەبێت، چونکە نەك ئەوان بەڵکوو هەموو بوون و گەردوون لە نەبووەوە پەیدابووە، وەك زانستی فیزیا نەبوویی و سەرەتایی بوون و گەردونی سەلماندووە.



**٢-** دروستكردنى ئاسمانەكان و زەوى: پاشان سەرنجمان ڕادەكێشێت بۆ بەڵگەيەكى دى، كە ئەويش دروستكردنى ئەو گەردوونە مەزن و فراوانەيە :﴿ لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾.[١] واتا: ((دروستكرنى ئاسمان و زەوى گەورەتر و مەزنترە لە دروستكردنى مرۆڤەكان، بەڵام زۆربەى مرۆڤەكان ئەوە نازانن.))

**٣-** زيندووكردنەوە و سەوز كردنەوەى زەوى (لەدواى وشك بوون و زەردبوونى): يەكێكى تر لەو بەڵگانەى كە قورئان ئاماژەى پێ دەدات لە بارەى زيندووبوونەوە، بريتيیە لە زيندووكردنەوەى ئەو زەويە كە وشك و زەرد دەبێت، كاتێك باران بەسەريدا دەبارێت دووبارە زيندوو دەبێتەوە و سەوزايى و گژوگيا دووبارە زەوى دادەپۆشێت، جا مرۆڤيش زۆر بەو زەويە دەچێت كە لێى دروستكراوە و تێيدا دەژيێت.﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَٰشِعَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ﴾.[٢]

**٤-** يەكسان نەبوونى چاكەكاران و خراپەكاران: يەكێكى تر لەو بەڵگانەى كە قورئان دەيهێنێتە بەردەمان لەسەر زيندوبوونەوە و وەرگرتنەوەى جەزاى كردەوەكان بريتيیە لەوەى كە نابێت چاكەكاران و خراپەكاران يەكسان بين و وەكوو يەك بن، كە ئەوەش هەم عەقڵ و هەم فيترەت ڕەتى دەكەنەوە و بە مەحاڵى دادەنێن كە كەسى باش و

---

(١) [غافر: ٥٧].

(٢) [فصلت: ٣٩].



کەسی لاڕێ وەکوو یەك بن و یەك ئەنجامیان هەبێت: ﴿ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾ ﴾.[١]

---

(١) ص: ٢٨.



## کردەیی و عەمەلی بوونی ئیسلام (العملية)



ئیسلام ئایینێکی کردەیی ئەرێنییە، شوێنەوار لەسەر ڕەفتار جێدەهێڵێت و لە کردەوەدا دەردەکەوێت. بۆیە خودای گەورە کە لە قورئاندا باسی باوەڕ دەکات، دەیبەستێتەوە بەکردەوەوە.

ئیسلام ئەوە لە بەندەکان قبووڵ ناکات کە بیروباوەڕەکەیان تەنها بیردۆزی و نەزەری بێت، هەروەها باوەڕی تەنها ئەندێشە و فیکر بێت و کاریگەری نەبێت لە کردنی کاری چاك و وازهێنان لە کاری خراپ، بەڵکوو داوایان لێ دەکات کەوا خاوەن باوەڕێکی کردەیی بن و بیروباوەڕێکی ئەرێنیان هەبێت کە بەرهەمی هەبێت لە خودی خاوەنەکەیی و ژیانی خەڵکدا.

ئەوەش چەند نموونەیەکن لەسەر لایەنی کردەیی باوەڕبوون بە نادیار و پەنهانەکان (عالم الغیب):

**أ-** ناو و سیفەتەکانی خودای گەورە: هەموو ناوێك لە ناوەکانی خودای گەورە کە خودای گەورە خۆی پێمانی گوتووە کاریگەری کردەیی هەیە لەسەر پاککردنەوەی نەفس و سلوکی مرۆڤ بۆ نموونە (الرقيب) چاودێر.

**ب-** پێغەمبەرایەتی: قورئان باسی پێغەمبەران و پەیامبەرانی بۆ کردووین، باسکردنێك کە پاڵ بە مرۆڤی باوەڕدارەوە دەنێت بۆ ئەوەی

هیدایەتیان لێ وەربگرێت و لەسەر ڕێبازیان بڕوات، ئەوەش گرینگترین ئەو تایبەتمەندیانەن کە قورئان تەئکید و دڵنیایی لێ کردووەتەوە:

١- خودای گەورە لە قورئاندا زۆر باسی سیفەتی ئەو پەیامبەرە هەلبژێردراوانەمان بۆ دەکات: وەکوو سپاردەپارێزی و ڕاستگۆیی لە گەیاندنی پەیامەکانی خودای گەورەدا و یەکلابوونەوە بۆ خودای گەورە لە بانگەوازیدا و داوێنپاکی، خاوێنی، لەسەرخۆیی، ئارامگری، نەرمونیانی و خۆبەکەمگری.

٢- خودای گەورە باسی پشتیوانی خۆی کردووە بۆ ئەو پێغەمبەرانە بەو موعجیزانەی کە گوزارشت و دەلالەت لە ڕاستگۆیەتی ئەوان دەکەن.

٣- قورئانی پیرۆز بە وردی باسی چیرۆکی پێغەمبەران دەکات، هەروەها باسی تێکۆشانیان لەگەڵ قەومەکەیان و ئارامگریان و ئەنجامی ئەو ململانێیە دەکات، بە شێوازی دووبارە و دڵنیایی و جۆراوجۆر.

٤- قورئانی پیرۆز مافی پێغەمبەری (دروودی خودای لەسەر بێت.) لەسەر ئوممەتەکەی ڕوونکردووەتەوە لە خۆشەویستی و ئەدەب و گوێڕایەڵی و کردنی بە پێشەنگ.

ج- بیستراوەکان: لە بابەتی بیستراوەکاندا (ڕۆژی دوایی و جیهانە پەنهانەکان وەکوو فریشتە و جنۆکە) قورئان باسی ئەوانەمان بۆ دەکات بەو ئەندازەیەی کە سوودی ئێمەی تێدایە و هانمان دەدات بۆ کردنی کردەوەی چاك[١].

---

(١) مختصر مدخل لمعرفة الإسلام: ئەم پەرتووکە کورتکراوەی دوو کتێبی (د.





## عەقڵانی بوونی ئیسلام (العقلانية)



عەقڵ و دین (ئیسلام) (نەقڵ) دوو دۆڵی لێك جودا نیین، بەڵکو هەردووکیان سەرچاوەکەیان خودایە، وەحی و عەقڵ هەردووکیان سەرچاوەکەیان خودایە، بۆیە ناکرێ تێکبگیرێن، نەقڵ بەبێ عەقڵ نابێ و عەڵیش بەبێ نەقڵ نابێ، ئەگەر عەقڵ چاو بێت، نەقڵیش ڕووناکییە، واتە نە چاو بەبێ ڕووناکی دەبینێت، نە ڕووناکیش بەبێ چاو دەبینرێت، وەك ئەنیشتاینیش دەڵێت: زانست بەبێ ئایین شەلە و ئایینیش بەبێ زانست کوێرە. کەواتە هەردووکیان تەواوکاری یەکترین و هیچ دژی یەکتری نیین، وەك وتراوە: (العَقْلُ قائِدٌ والدِّينُ مَدُدٌ) واتە: عەقڵ ڕابەرە و ئایینیش هاریکار، چونکە ئەگەر عەقڵ نەبایە ئایینیش نەیدەتوانی خۆی ڕابگرێ و بمێنێتەوە.

ئەو تێڕوانینەش زۆر هەڵەیە، کە بەردەوام بەربەستێکی دروستکردووە لەنێوانیاندا، چونکە عەقڵ و نەقڵ لە تێڕوانینی باوەڕداردا دووشتن، هەرگیز لێك دانابڕێن و بە دابڕاندنیان لە یەکتری مرۆڤ تووشی گرفتی

---

یوسف قەرزاوی)ییە لە ئامادەکردن و کورتکردنەوەی خۆمە، کورتکراوەی کتێبی (مدخل لمعرفة الإسلام) و (الخصائص العامة للإسلام)، ئەم بەشە (تایبەتمەندییە گشتییەکانی ئیسلام) لەوێوە وەرمگرتووە بە دەستکارییەوە، وە هەروەها بەشێکیشی لە پەرتووکی (لب العقيدة الاسلامية فى ضوء الوحى والعقل)ەوە وەرگیراوە، کە ئەویش لە کورتکراوەی خۆمە.



گەورە دەكات و لە زۆر شوێندا وەڵامەكان یان نادرێنەوە، یان بەهەڵە دەدرێنەوە.

زاراوەی عەقڵانی و نەقڵانیش لەژێر ڕۆشنایی ئەوەی کە باسمانکرد، زۆر هەڵەیە، چونکە ئەگەر عەقڵانی بی و نەقڵانی نەبی، ئەوە زۆر نا عەقڵانی و نانەقڵانی، ئەگەریش نەقڵانی بی و عەقڵانی نەبی، هەم دووبارە زۆر ناعەقڵانی و نانەقڵانی.

ئەم بابەتی دژیەكی عەقڵ و نەقڵە سەرەتا لەلای مەسیحی و جولەكەكانەوە دەستی پێكرد، چونكە ئینجیل و تەورات هەردووكیان دەستكاری زۆریان كراوە، تاگەیشتووە بەوەی ژمارەی ئینجیلەكان بگات بە ٧٠ ئینجیل، هەركەسێ دەهات بە ئارەزووی خۆی شتی لێ زیاد و كەم دەكرد و چۆنی ویستبا ئاوا دەیگۆڕی، وە لەلایەن كڵێساوە زۆرجار دژایەتی زۆری عەقڵ و زانست و زاناكان و فەیلەسوفان كراوە، بەڵام لە ئیسلامدا ئەم جۆرە كێشانەمان نیین، وەحی دەستكاری نەكراوە و پڕیەتی لە پشتگیری و هاندانی عەقڵ و عەقڵكاری و زەمكردنی بەكارنەهێنانی عەقڵ.

راغیبی ئەصفەهانی لە كتێبی (الذريعة إلى مكارم الشريعة) دا دەفەرموێت: خوای گەورە دوو نوێنەری خۆی ناردووە بۆ لای مرۆڤ، یەكەمیان: شاراوەیە و لەناو خۆیدایە كە بریتییە لە (عەقڵ)، دووەمیان: بەدەرەوەیە و دیارە كە بریتییە لە پێغەمبەر، مرۆڤ ڕێگەیەكی دیكە شك نابات پێی بگاتە ئەو نوێنەرە دیارە كە هەیە تا سوودی لێوەربگرێت لە ڕێگەی نوێنەرە شاراوەكەوە نەبێت كە عەقڵە، نوێنەرە شاراوەكە دەرك

بەوە دەکات کە نوێنەرە ئاشکراکە ڕاست دەکات، ئەگەر عەقڵ نەبوایە پێغەمبەر بەتەنها نەدەبووە بەڵگە لەسەر خەڵکی!

ئیمامی غەزالیش کە زۆرجار بە دژە فەلسەفە ناوزەند دەکرێت (لە ڕاستیدا ئەو دژی هەندێ بۆچۆنی هەڵەی فەیلەسوفان بووە نەك خوودی فەلسەفە) لە چەند شوێنێك و لە چەند پەرتووکێکیدا زۆر بەجوانی باسی عەقڵ دەکات، بۆنموونە لە پێشەکی کتێبی (المستصفی) دا دەفەرموێت: (عەقڵ وەك دادوەر وایە، کە هەرگیز ناکرێ لەسەر کار لاببرێت و شتێك بخرێتە جێی، شەرعیش وەك شایەتحاڵێکی متمانەدار و دادپەروەر وایە کە عەقڵ ئەکات بە کەشتی دینداری و هەڵگری سپاردەکانی خودا).

لەکوتاییدا ئەوەی پێویستە ئاماژەی پێبکرێت ئەوەیە کە عەقڵ لەگەڵ ئەو هەموو گرینگی و گەورەییەی، بەڵام ناکرێ بکرێتە سەنتەر و سەرچاوەی سەرەکی و حاکم و بڕیاردەری ڕەها، چونکە عەقڵەکانیش لە کەسێکە و بۆ کەسێکی دیکە و لە شوێنێك و سەردەمێك بۆ شوێن و سەردەمێکی دیکە دەگۆڕێت، بۆنموونە عەقڵی فەیلەسوفەکان لەگەڵ عەقڵی پزیشکەکان، یان عەقڵی عەوام لەگەڵ عەقڵی زانایان، یان عەقڵی کەسێکی مارکسی لەگەڵ کەسێکی لیبڕاڵ، یان کۆمەڵناسێك و ئابووری ناسێك، لەیەك جیاوازە، یان سوقرات و ئەفلاتون و ئەرستۆ، کە هەرسیکیان مامۆستا و قوتابی یەکتر بوون، بەڵام لە زۆر شتدا جیاوازبوون، کەواتە ئێمە عەقڵێکی ڕەهای جێگیری نەگۆڕی کۆدەنگی لەسەرمان نییە (غەیری چەند یاسایەکی گشتی عەقڵی، کە پێویستە هەموو مرۆڤێکی عاقڵ بڕوای پێیان بێت، وەك یاسای: دوو شتی دژ بەیەك لە یەك کات و شوێن و

کەسدا کونابنەوە، یان...)، کەواتە ناکرێ ئێمە عەقڵی چەند کەسێك یان بەرژەوەندی دەستە و تاقمێك بکەینە دادوەر و هەموو شتەکان بکەینە قوربانی، بەتایبەتی لە دونیای ماددیگەرایی و سەرمایەداریدا هیچ بنەمایەکی عەقڵی ئەخلاقی بوونی نامێنێت غەیری مادده و بەرژەوەندی و شەهوەت و ئارەزوو....، کەواتە دەبێ بەهاوسەنگییەوە سەیری ئەم بابەتە بکرێت و نە عەقڵ بەرەهایی نە نەقڵ بەرەهایی، بەڵکو وەك دوانەیەکی دەستەملان سەیربکرێن و مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت، لە ژێر عەقڵی ساغ و نەقڵی ڕاست و واقیع و زانست و سەردەم و بارودۆخدا.

عەقڵ وشەیەکی عەرەبییە، لە ڕووی زمانەوانییەوە بە چەند مانایێك دێت:

**١.** (الحبس)، واتە: بەندکردن، بەندکردنی مرۆڤ لە کردار و گوفتار و هەڵسوکەوتی خراپ. کەواتە ئەوە عەقڵە کە مرۆڤ بەند دەکات لەوەی کارێك یان گوفتارێکی خراپ بکات.

**٢.** دژی نەزانی و جەهلە، بۆیە لە زمانی عەرەبیدا کە دەڵێیت: (عقل، یعقل)، واتە: زانی لە دوای ئەوەی کە نەزان بوو بەو شتە.

**٣.** بەستنەوە، بۆیە لە زمانی عەرەبیدا کە دەڵێیت: (عقل، یعقل)، واتە: بەستیەوە، یان (عقال البعیر) ئەو شتەیە کە وشتری پێ دەبەسترێتەوە، کەواتە بەو پێیە عەقڵ ئەو ئامرازەیە کە زانیاری و زانست و ڕاستی شتەکان دەبەستێتەوە، وەك جورجانی دەفەرمووێت: (العقل: ما یعقل حقائق الأشیاء)، واتە: «عەقڵ ڕاستییەکان دەبەستێتەوە، هەروەك چۆن ( عقال) وشتر دەبەستێتەوە.»

## گرنگیدانی ئیسلام به عەقڵ:

### قورئـــــان

**١.** قورئان زۆر زۆر گرنگی به عەقڵ داوە، بەشێوەیەك عەقڵ وەك ناو (اسم) نەهاتووە لە قورئاندا، بەڵكوو ئەوەی هاتووە بەشێوازی كردار هاتووە، وەك (عقلوه – يعقلون – نعقل – يعقلها – تعقلون).

موشتەقاتی عەقڵ (٤٩) جار لە قورئاندا هاتووە. ئەوەش كە بەشێوازی كردار هاتووە و بەشێوازی ناو (اسم) نەهاتووە ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە عەقڵ دەبێ بە كردار بكرێت، ئەگەرنا بوون و نەبوونی یەكسانە.

### چەند ئایەتێك دەربارەی عەقڵ و هاندان بۆ خستنەكاری:

*{أَتَأْمُرونَ الناسَ بِالبِرِّ وَتَنْسَوْنَ أَنْفُسَكُم وَأَنْتُم تَتْلُونَ الكِتَابَ أَفَلاَ تَعْقِلُونَ}.[1]

*{كَذَلِكَ يُحْيِ اللهُّ المَوْتَى وَيُرِيكُم آياتِه لَعَلَّكم تَعْقِلُونَ}.[2]

*{أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُم قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا}.[3]

---

(١) [البقرة:٤٤]

(٢) [البقرة: ٧٣]

(٣) [الحج: ٤٦]

* {إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِنْدَ اللَّهِ الصُّمُّ الْبُكْمُ الَّذِينَ لا يَعْقِلُونَ}.[١]

* (إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُوْلِي الألْبَابِ).[٢]

* (إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنزَلَ اللّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِن مَّاء فَأَحْيَا بِهِ الأرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخِّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ).[٣]

*{وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ }[٤]

((هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆ ئێوەی ڕام هێناوە، بۆ خزمەتگوزاری ئێوە فەراهەمی هێناوە، هەموویشی تێکڕا بەخشش لەلایەن ئەو زاتەوە، بەڕاستی ئا لەو بەخشش و دیاردانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێك کە بیربکەنەوە و تێبفکرن.))

*{وَهُوَ الَّذِي أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ قَدْ فَصَّلْنَا الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ}.[٥]

---

(١) [الأنفال: ٢٢]

(٢) [آل عمران: ١٩٠]

(٣) [البقرة: ١٦٤]

(٤) الجاثية (١٣)

(٥) الأنعام (٩٨)

((هەر ئەو زاتە ئێوەی لە تاكە كەسێك بەدیهێناوە، سەردەمێك (بەشێكتانی لە پشتی باوكتاندا) نیشتەجێ كردبوو (كە گوێزرانەوە بۆ ناو سكی دایكتان) ئەو شوێنە ئێوەی گرتەخۆ (تا تیایدا نەشونما بكەن، یاخود بۆ ماوەیەك ئێوەی لەسەر ڕووكاری زەوی دانا، دوایی لە توێیدا شاردنیەوە تا ڕۆژی قیامەت) بەڕاستی ئێمە نیشانە و بەڵگەی زۆرمان (لەسەر دروستكردنی ئێوە و دروستكاری خۆمان هێناوەتەوە) بۆ كەسانێك كە تێ بفكرن وردبین بن.))

كەواتە قورئان پڕیەتی لە مەدح و ستایسشی عەقڵ و هاندان بۆ بەكارهێنانی و زەمكردنی ئەوانەی عەقڵ ناخەنەكار و بیرناكانەوە و تێناگەن.

**٢.** قورئان زەمی ئەو كەسانە دەكات كە عەقڵ بەكارناهێنن و بیرناكەنەوە، وەك دەفەرموویت:

* {صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ}.(١)

* {اتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَايَعْقِلُونَ}.(٢)

* {يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ}(٣)

* {إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِنْدَ اللَّهِ الصُّمُّ الْبُكم الَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ}.(٤)

---

(١) [البقرة: ١٧١ ]

(٢) [المائدة: ٥٨]

(٣) [المائدة: ١٠٣ ]

(٤) [الأنفال: ٢٢]

*{أَفَأَنْتَ تُسْمِعُ الصُّمَّ وَلَوْ كَانُوا لَا يَع قِلُونَ}.(١)

*{وَيَجْعَلُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ}.(٢)

*{أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْقُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا}.(٣)

*{قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ }.(٤)

*{وَمَنْ نُعَمِّرْهُ نُنَكِّسْهُ فِي الْخَلْقِ أَفَلَا يَعْقِلُونَ}.(٥)

*{قُلْ أَوَلَوْ كَانُوا لَا يَمْلِكُونَ شَيْئًا وَلَا يَعْقِلُونَ}.(٦)

*{إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِنْ وَرَاءِ الْحُجُرَاتِأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ}.(٧)

*{تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْقَوْمٌ لَا يَعْقِلُونَ}(٨)

*{أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنْسَوْنَ أَنْفُسَكُمْوَأَنْتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ أَفَلَاتَعْ قِلُونَ}(٩)

---

(١) [يونس: ٤٢]

(٢) [يونس: ١٠٠]

(٣) [الحج: ٤٦]

(٤) [العنكبوت: ٦٣]

(٥) [يس: ٦٨ ]

(٦)

(٧) [الحجرات: ٤]

(٨) [الحشر: ٤]

(٩) [البقرة: ٤٤]

